کریس هارمن



# سەرهەڵدانەوەی پرسی نەتەوەیی

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

عوسمان حەسەن شاکر

کریس هارمن

# سەرهەڵدانەوەی پرسی نەتەوەیی

وەرگێڕانی لە فارسی‌یەوە

عوســمان حەســەن شاکر

ناوی کتێب: سەرهەڵدانەوەی پرسی نەتەوەیی
نووسەر: کریس هارمن
وەرگێڕانی لە فارسی‌یەوە: عوسمان حەسەن شاکر
بابەت: لێکۆڵینەوە.
لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کۆمۆنیست
تیراژ: ٥٠٠دانە
پیت چنین: نیاز صالح ئەحمەد -کۆمپیوتەری کوردستان
چاپ: چاپخانەی سەفوت
چاپی یەکەم: سلێمانی-١٩٩٩
ژمارەی سپاردن: (٣٢٥)ی ساڵی ١٩٩٩

# پێشەکی

دەتوانین بڵێین ئەو قسەیەی کە هەمووان دەیڵێن، وە بەردەوام چەند بارەی دەکەنەوە ((ناسیونالیستەکان جوداخوازی دنیای ئەمڕۆن))، لە ئێستادا تا ڕادەیەکی زۆر بۆتە تێزێکی بنچینەیی. قسەکردن دەربارەی ((سیستەمی نوێی جیهانی))و ((کۆتایی مێژوو)) ڕەنگە درێژە نەکێشێ، بەڵام ئەوەی کە شوێنی ئەوانەی گرتۆتەوە، بەڕای من نە سیاسەتە چینایەتی‌یەکانە، کە زۆرتر کێشمەکێش و کێبەرکێی نێوان ناسیونالیستە تازە ڕابووەکانە - وە هەتا بەشێکی یان بە تەواوی تازە لەدایك بووەکانە- لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی کە ئەم دەربڕینانە بەکار دەهێنن، لەکاتی پێناسەکردنی تووخمە پێکهێنەرەکانی ((نەتەوە))دا ڕووبەڕووی گەلێك گرفتی گەورە دەبنەوە. نیشتەجێبوون لە ناوچەیەکی جوگرافیای دیاریکراودا ناتوانێ تووخمی بنەڕەتی - سەرەکی پێکهێنەری نەتەوەیەك بێت- لەبەر ئەوەی لەو حاڵەتەدا سەبارەت بەو کەمە نەتەوانەی کە نایانەوێت ببنە بەشێك لەو زۆرایەتیانە(اکثریە)ی کە لەگەڵیاندا لە یەك ناوچەدا دەژین، دەتوانین چی بڵێین؛ ئەو تووخمە سەرەکی‌یە، لە هەمان کاتدا، ناکرێ بە تەنها زمان بێت- لەم حاڵەتەدا سەبارەت بە سربەکان کرواتەکان و بۆسنی‌یەکان کە بەیەك زمان قسە دەکەن، وە لە هەمان کاتیشدا ڕایدەگەیەنن کە نەتەوە گەلێکی جیاوازن، دەبێت چی بگوترێت؟ وە یاز دەربارەی بنیاتنەرانی هند کە هەوڵ دەدەن زمانی هندی، کە تێکەڵاوێکە لە دیالکێتە ناوچەیی‌یەکانی هندستان، وەك ((زمانی نەتەوەیی)) تەواوی نیمچە کێشوەری هندستان بیسەپێنێت، دەتوانین چی بڵێین؟ ئەم تووخمەش واتە ((ڕۆشنبیری)) گشتی باو دیسان ناتوانێت تووخمی سەرەکی پێکهێنەری ((نەتەوە)) بێت، چونکە لە هەموو شوێنێکدا لە چوارچێوەی سنوورەکانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی‌دا، گەلێك جیاوازی ڕۆشنبیری وە یان شێوازەکانی ژیان گوزەراندن لەنێوان دەوڵەمەندان و

هەژاراندا، وە یان لە نێوان کرێکاران و جووتیاراندا، زیاترە لە جیاوازی ڕۆشنبیری لە نێوان هاوسێکانی هەمان چیندا لە هەردوو دیوی سنوورە نەتەوەیی یەکاندا.

هەروەها دەرکردنی یاسایەکی تایبەب کە کۆمەڵێك لە خەڵك - یان ڕابەرانی داهاتووی ئەوان - بە پێی ئەوە، ئەو دەرئەنجامەی بەرهەم بێنن، کە دەبێت نەتەوەیەك پێکبهێنن.

ئۆتۆریتە (نفوذ معنوي) زانستی یەکان لەگەڵ هەڵوێست گرتنە جیاوازەکاندا، وەك: ئەکادیمست ((چەپە کۆنەکان)) ئەریك هابزیام (١)، ئەکادیمستە ((چەپە نوێیەکان))، بەندێکت ئاندرسن(٢)، ئەکادیمستە لیبراڵەکانی وەك ئەریك گلن(٣)و ئەدیتوری پێشووی سۆسیالیستی ئەنتەرناسیونالْ نایجل هەیسن(٢)، لانی کەم لەم بوارەدا یەك قسەن. بەڕای ئاندرسن نەتەوەکان پێکهاتە گشتی یە خەیاڵی یەکانن ئەگەرچی لەم بوارەدا خەیاڵ بالأدەستە، دەتوانن هەموو چەکە دزێوەکانی دەوڵەت لەپێناوی سەپاندنی بیروباوەڕەکانی دا بەسەر ئەوانەدا کە ناتەبان لەگەڵیدا، بەکار بیات.

ئایدیۆلۆژیستە ناسیونالیستەکان هەمیشە تێدەکۆشن تا بنەچەی نەتەوەکەیان بۆ سەدەها ساڵ لە ڕابردووی مێژوویی بگێڕنەوەو بەرگێکی لەو چەشنەی دەکەن بەبەردا. بۆ نموونە: ئەو قسەیەی کە مێژووی ئینگلستان بۆ پادشایەك بەناوی ئالفریدو چاوەسووتاوەکانی، و ئەتلری بە ناتامادەییەوە دەست پێدەکات، یان حکومەتی تووجمان قسە لە هەزار ساڵ حکومەت کردنی کرواتەکان دەکات، وە یان حکومەتی سربستان شەڕی کۆسۆڤا لە ساڵی ١٣٨٩دا سەرلەنوێ زیندوو دەکاتەوە، وە یان کاتێك کە ناسیونالیستەکانی ڕۆمانیا دەڵێن کە درێژەپێدەری چاخێکن کە تێیدا خەڵکانێك لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمدا لە داسیادا دایانمەزراند، هەموویان وەك یەك بە قووڵی باس لە ڕابردوو دەکەن (٥). هەموو ئەو قسانە، بەبێ جیاوازی پشتیان بە مێژووە ئەفسانەیی یەکان بەستووە. لەبەرئەوەی کە نەتەوەکان هەروەك پێکهاتە گشتی یە بەردەوامەکان پەیدانەبوون.

نەتەوەی مۆدێرن بە ئایدیای دەستەیە (هیات)کی چوون یەك (همگون) لەو شارنشینانەی کە خاوەن مافی یەکسانن وە بەیەك زمان قسە دەکەن، بە هەمان ئەندازەی خودی سەرمایەداری بەرهەمێکی مێژوویی تا ڕادەیەك هاوچەرخە. نەتەوە چەمکێکە کە لە هەر توێژینەوەیەکی جدی کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداریدا، کە تەواوی دنیایان تا سەدەی شانزەهەم داپۆشیبوو، وە لەسەدا نەوەدی دنیا تا کەمێك پێش لە سەدەی پێشووی دەگرتەوە، ناتوانرێ جیابکرێتەوە، هەروەك کە لە توێژینەوەی ئەو کۆمەڵگایانەدا ناتوانرێ قسەیەك لەبارەی ئۆتۆمبیل و چەکی ئۆتۆماتیکییەوە بکرێت.

لە ڕاستیدا، ئەمە پەیوەندی نێوان دروست بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی و پەیدابوونی سەرمایەدارییە، کە ئێمە بۆتێکەیشتنی هێزی ئەو ئەفسانانە ڕادەکێشێ کە خەڵك دەکاتە قەسابی یەکتر - وە لەم بوارانەدا هەروەك هەر جەنگێکیتر هەژارەکان دەبنە قەسابی یەکتری، نەك دەوڵەمەندەکان یەکتری قەسابی بکەن.

# سەرمایەداری و نەتەوە

دەوڵەتـەکان ڕێکخـەری کۆمـەڵگاکانی پێـش سـەرمایەدارین، بـەڵام ئـەم دەوڵەتانە لە چاو زۆربەی چالاکی‌یەکانی کۆمەڵانی بەرینی خەڵکدا ڕەگەزێکی دەرەکی پێکدەهێنن. دەوڵەتـەکان خـەڵك ناچـار دەکـەن بـەدانی پـارەو بـاجی جیاوازو بە شاڵاوە داگیرکاری‌یـەکانیان بەشبەشـیان دەکـەن، وە بـە گوشـارو گلـت و بـەڵێن ناچاریـان دەکـەن کـە بـە سـووپاکانیانەوە پەیوەسـتبن. بـەڵام هەڵسـووڕانی سـەرەکی و ڕۆژانـەی ئەوانـە کـە پـەیداکردنی بژێوییانـە، واتـە کشـتوکاڵ کـردن لـەپێناوی تـێرکردنی پێداویسـتی‌یەکانیان بەدەسـت لێنەدراوی دەمانەوە، ئەگەرچی بەشێکی کەم لە بەرهەمەکانیان بە مەبەستی ئاڵ و گۆڕ بەرهەم دەهێنرا.

کۆمەڵگای کشتوکاڵی - دەرەبەگی پشتی لەژێر گوشاری باجە قورسەکاندا چـەمابۆوە، کـەوتبووە ژێـر سـتەمی شـەڕنگێزانەی یاسـاوە، بـەڵام ئەمانـە هەمووی شێوازی دەسەڵاتداران و زانایانی ئایینی‌یـە (کە بە زۆری هەریـەکێك بوون) و خۆی لە خۆی‌دا پەیمان بەستن و بوون بە بەشێك لە یەك دەوڵەتی ناوەندی‌یە. ئینگلستانی ئەو ڕۆژانە (کە لە ئینگلستانی ڕاستەقینە، زۆربەی بەشـکانی ڕۆژئـاوای فەڕەنسـای ئێسـتا، چەند بەشێك لـە وێلـز، ئێرلـەنداو ئسـکوتلەندا، پێکـهاتبوو) ڕەنگدانـەوەی خەسـڵەتە ئاشـکراکانی، کۆمـەڵگا گەلێکی ئاوەهـا بوو. لەوێدا فـەرمانڕەوایان سـوودیان لـە سیسـتەمێکی یـەك زمـانی وەردەگـرت (فەڕەنسـایی نـەرم)، بەڕێوەبـەرانی خـاوەن بڕوانامـەو هەڵبژێردراو، زمانێکی‌تریان بەکار دەهێنا (لاتینی ناوەڕاست)، وە کۆمـەڵانی خەڵك بە دیالێکتە جیاوازەکان قسەیان دەکرد (چەند شێوازێکی جۆراوجۆر لە ئەنگلوساکسۆن، فەڕەنسی.ولش، و گلییك).

لە کۆمەڵگایەکی ئاوادا دەکرا دەوڵـەت بە مێژو ناوەندی بێـت، وە یـاخود بێـمێژو بەشـبەش، بـەڵام هـەرچۆنێك بێـت دەوڵـەتی نەتـەوەیی بـەو مانایـەی ئـەمڕۆی کـە ئێمـە تێیدەگەین، بوونێکی دەرەکی نـەبووە. بۆچوونـی خـەڵکانی ئەو دەوڵەتانە لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەوە نەبوو کە خۆیان بە هاوڵاتیەکی وا

دابنێن یان بزانن کە بە زمانێکی هاوبەش دەدوێن، وە یان تەنها وەفادارانە بەرامبەر بە یەکەیەکی جوگرافی یەکگرتووی لە دابەشکردنی نەهاتوو، لە خۆیان نیشان بدەن.

لە سیستەمی سەرمایەداریدا مەسەلەکە تەواو جیاوازە.هەر لایەنێك لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵك، لە کارکردنیانەوە بیگرە تا دەگاتە خواردنێك کە دەیخۆن و پۆشاکێك کە دەیپۆشن وە یان وە خۆشی و زەماوەندەکانیان، هەر هەمووی، دەکەونە ژێر کاریگەری بازاڕەوە. بەپەرەگرتنی بازاڕ، دام و دەزگائیداری‌یەکان، چ دام و دەزگای خودی دەوڵەت بێت یان هەر کۆگاو پرۆژەیەکی تایبەتی بێت، فراوانتر و پەرەگرتووتر دەبن.

ئەفسانە داڕێژانی ئایدۆلۆژیای سەرمایەداری بە قسە بانگەشە بۆ دەوڵەتێکی بچوك و سنووردار دەکەن. بەڵام لە ڕاستیدا، کاریگەری بەهێزو هەمیشەیی بازاڕی پەرەگرتوو بەربڵاو تەنها بە شێوەیەك مسۆگەر دەکرێت، کە دەوڵەتێکی بە هەمان ئاست و ڕادە پەرگرتوو بەربڵاوو کاریگەر پشتیوانی لێ بکات - بڵاوکردنەوەی ئەسکەنناس، مسۆگەرکردنی دانەوەی قەرزەکان، بەرتەسك کردنەوەی گەندەڵی و کڵاو لەسەر خەڵکی‌نان (کڵاه برداری)، دروست کردنەوەی قادرمەو جادەکان، پاراستنی دەوڵەمەندەکان لە تۆڵەی هەژاران، هەڵگیرساندنی جەنگ، وە لە هەموو ئەمانەش گرنگتر سەپاندنی باجگەلێکی ڕێك و پێك و بە بەرنامە بەسەر خەڵکدا، ئەمانە هەمووی تەنها لە ئەستۆی دەوڵەتێکی وەهادایە.

بەڵام ئامرازی بەڕێوەبردن بەبێ بوونی ئامرازێکی پەیوەندی سادەو ساکار لەنێوان ڕەگەزە جیاوازەکانیدا، واتە زمانێك کە هەموویان قسەی پێ بکەن، ناتوانێت قورسایی‌یەکی کاریگەر هەبێت. لە هەمان کاتدا، دام و دەزگای بەڕێوەبردن وای پێ باشە کە ئەم ئامرازی پەیوەندی‌یە زمانێك بێت کە زۆربەی خەڵکی ژێر دەسەڵاتەکەی قسەی پێ بکەن: بەم شێوەیە چاودێری کردنی ئەوانە لەلایەن کارمەندانی نهێنی‌و باجگرانەوە زۆر ئاسان دەبێت، وە هاوکاری نێوان کاربەدەستانی بەدەسەڵات و بەڕێوەبەرانی بەردەستیان لە خوارەوەدا زۆر چالاکترو باشتر دەچێتە پێشەوە.

# یەکەمین دەوڵەتە نەتەوەیی‌یەکان

سەرمایەداری بۆ یەکەمین جار لە سەدەی شانزەهەم بەدواوە تەکامولی خۆی لە هۆڵەنداو ئینگلستان دەست پێ‌کرد - هەرچەندە پەیوەندی‌یەکانی پشت بەستوو بە بازاڕ، و هاوشان لەگەڵ ئەودا یەکەمین سەرەتاکانی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری لە چەند شوێنێکی ئیتالیاو فلاندرزی سەدەی چواردەهەم، ئەڵمانیا، فەرەنساو بۆ هیمیای سەدەی شانزەهەم پەیدا ببو. لە هەر بوارێکی پەیدابوونی بازاڕدا، بە شێوەیەکی خۆبەخۆیانە، ئەو ڕەگەزانە یاخود (عناصر)انەیان بەرهەم هێناوە کە لە کۆبوونەوەی خۆیان دەوڵەتی نەتەوەیی‌یان دروست کرد.

پەرەگرتنی ئالوێری شمەك بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی ناوچە جیاوازەکان پەیوەندی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی زۆر لە نێوانیاندا دروست ببێت. بازرگانە شاری‌یەکان ڕوویان لە لادێکان کرد، دەکڕن و دەفرۆشن، وە لەگەڵ خەڵکی دواکەوتووترین لادێدا قسە دەکەن. ئەو بازرگانانە بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ ئەو لادێیانەدا قسە بکەن. ناچار بوون کە چەندەها گۆشەی شێوەزمانی ئەو لادێیانە فێر بن و قسەی پێ بکەن. ئەوان ئەو شێوە زمانەی کە فێری ببوون تێکەڵاوییان کرد لەگەڵ زمانی شارەکان و خود بە خودو نائاگاهانە شێوازی ئیستنداردی زمانیان دروست کرد، زمانێك کە فێر بوونی بۆ هەر کەسێك پەیوەندی لەگەڵ بازرگانی تازەدا هەبێت، بێ‌سوود نەبوو. بازرگانەکان ئەو پەندبێژلنەیان لە دەور کۆببۆوە- کە زۆربەیان لەو ڕووەوەی کە هەم بە گیرفان و هەم بە دەروونیشیان سوودمەندبن- و هەروەها کەسانێك کە خەریکی ڕاکێشانی پیاوان بوون بۆ نێو ڕیزی سوپا بەکرێگیراوەکان (لرتش های مزدور)، هاوڕێیەتیان، دەکردن. لە هەمان کاتدا هەژارترین لادێی لادێکانیان بە مەبەستی گەڕان بەدوای کاردا جێ‌دەهێشت، هەروەها دەوڵەمەترین لادێیش بەمەبەستی بڕینی دەستی ئەو کەسانەی کە لە جیاوازی نرخی شت و مەك لەنێوان لادێکان و شارەکاندا سوودمەند

دەبوون (واتە وەسیطەکان) خۆیان بەرەو شارەکان ڕۆیشتن تاوەکو دەست بە ئاڵ و وێری ڕاستەوخۆی بەرهەمەکانیان بکەن. لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا، لە حاڵێکدا کە جووتیارێکی فەرەنسی سەر بە توێژی ناوەند بە درێژایی هەموو ژیان و کارکردنی، هەرگیز زیاتر لە هەشت کیلۆمەتر گەشتی نەکردبوو، کەچی لە هەر حەوت کەسی ئینگلیسی یەکێکیان بەشێکی ژیانی لە لەندەن بەسەر بردبوو(٦). بە شێوەیەکی خۆ بە خۆیانە تۆڕە بازرگانیەکان وورده وورده گۆڕان بە تۆڕە زمانییەکان. پاشان بەڕێوەبەرانی دەزگا دەوڵەتییەکان، کە خولیای کۆکردنەوەی باج بوون لە بازرگان و تاجرە گەورەکان، تێگەیشتن کە پێویستە کارەکانیان بە زمانی بازاڕ بەڕێوەببەن، نەك بە زمانی دەربارو کڵێساکان،هەروەها نووسەرە داهێنەرەکانیش تێگەیشتن کە ئەگەر دەیانەوێت خوێنەروگوێگر بۆ خۆیان پەیدا بکەن، دەبێت ئەو زمانە تازەیەی کە قسەی پێ دەکرێت بەکار ببرێت - ئەوە بوو کە دانتیێ لە سەدەی چواردەهەمدا لە فلۆرەنسا، چاوسەر نیو سەدە دواتر لە ئینگلستان، لوتەرو رابیلیە لە سەدەی شانزەهەمدا لە ئەڵمانیاو فەرەنسادا بە سوود وەرگرتن لەو زمانە نوێیەی قسەکردن دەست پێشخەرییان کرد.

پێکهاتنی ئەم گۆڕانکارییانە ماوەیەکی درێژی خایاند - هەتا لە سەدەی هەڤدەدا هابز لە ئینگلستان و سپینوزا لە هۆڵەندا، توانایییان دەقە سەرەکیو بنەڕەتییەکانیان بە زمانی لاتینی بنووسن، بەڵام لە هەر شوێنێکدا کە سەرمایەداری سەقامگیر دەبوو زمانی تازەش زیاتر دەچەسپی، بە پێچەوانەشەوە لە هەر جێگایەکدا کە سەرمایەداری سەرەتایەکی درۆزنانەو ڕووکەشانەی هەبووەو پاشان خۆی داوە بەدەست زیندوکەرەوانی سیستەمی کۆنەوە، زمانەتازەکان تا ڕادەیەکی زۆر بەرچاو زیانیان پێدەگەیشت: سەرلەنوێ ژیانەوەی فیئۆدالیزم لە ئیتالیای کۆتاییەکانی ڕێنیسانسدا، لە هەمان کاتدا ئەو مانایەشی دەبەخشی کە دەقە ئەدەبییەکان ئیتر بە زمانی لاتینی دەنووسرێت تا بە زمانی ئیتالی

دانتی(١٧)؟ هەروەها شکستهێنانی پرۆتسانیزمی بۆ هێمی لەلایەن لایەنگرانی دژە ڕیفۆرمیزمی چەکدارەوە لە ساڵی ١٦٨١دا لە جەنگی شاخە سپی‌یەکاندا، لە هەمان کاتدا بە مانای شکستی زمانی چیکی بوو وەك زمانی نووسین بۆ ماوەی نزیك بە دووسەد ساڵ؛ لە ئیمپراتۆریەتی هابسبۆرگدا، زمانی لاتینی تا دەیەی ١٨٤٠ وەك بەڕێوەبردن درێژەی بە تەمەنی خۆیدا.

ئەو ڕەگەزانەی کە یەکەمین نەتەوەکانیان بەرهەم هێناوە، ژیانی خۆیان هاوشێوەی تۆڕەکانی، بازرگانیو بەڕێوەبەرایەتیو زمانی کە لە دەوروبەری شارە گرنگەکاندا گەشە دەکەن، دەست پێدەکەن، لە هەموو شوێنێکی ئەوروپادا، کارمەندانی دوایین دەسەلاتدارێتی‌یە فیئۆدالی‌یەکان تێدەکۆشن تاکو هێزو توانای خۆیان لە بەرامبەر ئەندامانی چینی فەرمانڕەوای کۆمەڵگای فیئۆدالی کۆندا، بە یەکگرتن لەگەڵ بازرگانان و پیشەوەرانی شارەکاندا زیاتر بکەن. ئەم ((شارنشینانە)) بە زۆری لە ناوەندە جوگرافیایی‌یەکاندا تۆڕە لێکگرێدراوە پتەوەکانی بازرگانیو زمان پێك دەهێنن، هەندێك لە کارگوزارانی دەوڵەتی توانییان سوودی گەورەی گۆڕانی زمانی شارنشینەکان بە زمانی دەوڵەت دەرك پێبکەن. لەم ڕووەوە، ئەوان بە پتەوکردنی یەکێتی خۆیان بە بازرگانەکان و پیشەوەرەکانەوە هەوڵیاندا، تا دەوڵەتێکی نەتەوەیی بە زمانێکی یەکگرتووە دروست بکەن. دەوڵەتێك کە بە پێچەوانەی دەوڵەتەکانی پێشووترەوە دەیتوانی لەسەر تازەکردنەوەی بەڵێنی پابەندبوونی هەموو ئەو کەسانەی کە لە سنوورەکەیدا دەژین، سوور بێت.

سەرهەڵدانی ئەو دەوڵەتانەی کە لەسەر بنچینەی زمان دامەزراون، بۆ بورژوازی تازە پەیدابوو گەلێك قازانجی گەورەی هەبوو. ئەو دەوڵەتانەی کە مەسەلەی ئەو بازرگانانەی شوێنەکانی‌تر کە بە زمانە ((دەرەکی-خارجی))کان قسە دەکەن، لە کێبەرکێیاندا لەگەڵ بازاڕەکانی ((ناوخۆ))دا، بەگرفتر دادەنێ. ئەم پیاوانەی دەوڵەت کە زۆرتر لە جاران کەوتوونەتە ژێر گوشاری بازرگانەکانەوە، بەگەرمیو پەرۆشی‌یەوە بە شوێن

بەرژەوەندی‌یەکانی ئەوانەوەن. ئەم مەسەلەیە بەتایبەتی کاتێك کە دەوڵەت بە هاوکاری ئەوان لە کێبەرکێ‌دا لەگەڵ گروپە بازرگانی‌یەکانی بەرامبەردا لە بازارە جیهانی‌یەکاندا، پەلە دەکات، بەرچاوترە- وەك کۆمپانیا خاوەن ئیمتیازە هۆڵەندی‌و ئینگلیزی‌یەکان لە سەدەی هەژدەهەمدا کە لە کێشمەکێش و خەباتیاندا لەپێناوی کۆنترۆڵکردنی بازرگانی هندی رۆژهەڵاتدا، لەلایەن دەوڵەتەکانیانەوە پشتیوانیان لێ دەکرا؛ هەتا لە هەندێ جێگای وەك فەرەنسای سەدەی حەڤدەهەم، دەوڵەت کە شێوەی فیئۆدالیانەی خۆی پاراستبوو، بە تەواوەتی سوور بوو لەسەر پاراستنی بەرژەوەندی‌یەکانی سەرمایەداری تازە پەیدا بوو.

بەلام ئەگەر پەیدابوونی دەوڵەتی نەتەوەیی دەسپێکێکی خودبەخودی هەیە، ئەوا چەندەها رەگەز ((عنصر))ی هۆشیاریش بە زۆری دەستیان بە دەخاڵەتکردنی کردووە، فەیلەسوفانی سیاسەت لە دەمی ماکیافیللی- لە هەمان سەرەتای سەدەی شانزەو- بەدواوە چەندەها سیاسەتیان بە مەبەستی خێراترکردنی جولانی ئەم رەوەندە خود بە خودییەیان بەسەر دەوڵەتەکاندا سەپاند. تیوریسیانیانی ئابووری سیاسی، دکترین ((مەرکانتایلسم)) کە بە تێروانینی ئەو بەرژەوەندی‌یەکانی دەوڵەت بەکەڵکەبوونی سوودی بازرگانی بازرگانەکان یەك تێروانینی هەبوو، کە پەیرەوکرا. نووسەرانی شانۆ، شاعیران، ووتارنووسەکان، بۆ یەکەمین جار دەستیان کرد بە پیرۆزکردنی چەند شتێك کە پاشان بە نەریتە ((نەتەوەیی‌یەکان)) ناسران.

دەوڵەتی ((نەتەوەیی)) تازە بە کردەوە سەلماندی کە قازانجی زۆری بۆ دەسەڵاتداران هەیە، جا ئەم دەسەڵاتدارانە چ لە ئۆرۆستوکراتیەتی کۆنی بە رووکەش تازە بێت، وە چ لە چینی سەرمایەداری لە حاڵەتی گەشەکردندا بێت. دەوڵەتی ((نەتەوەیی)) لە رووکەشدا جۆرێك لە هاوپشتی لە نێوان چەوسێنەران و چەوساوەدا هێنا بووە ئاراوە؛ هەرچەندە کە پێشهاتەکان و شێوازەکانی ژیانی ئەم دووبەشەی خەڵك لەگەڵ یەکتردا جیاوازی‌یەکی

زەقیان هەبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خاڵی هاوبەشیشیان هەیە؛ ئەوان بە زمانێك قسە دەکەن کە خەڵکی‌تر لێی تێناگات. ئەم مەسەلەیە بەتایبەتی بۆ بەشێك لە چینی ناوەند گرنگی‌یەکی زۆری هەبوو، چونکە ئەوان بە فێربوونی زمان و سەلماندنی وەفادارییان بۆ دەوڵەت، دەتوانن لە خودی دام و دەزگا دەوڵەتیەکاندا کارێك پەیدا بکەن، کە کەسانی سەر بە کەمە نەتەوەیی‌یەکانی ناوخۆو هەروەها خەڵکی کۆلۆنیەکانیش لە دەرەوەی وڵات، لە پەیداکردنی کارێکی ئاوەها بێبەش بوون.

## مەیلی پێکهێنانی دەوڵەتە نەتەوەیی‌یە نوێ‌یەکان

بڵاوبوونەوەی سەرمایەداری لە سەرتاسەری گۆی زەویدا بە فراوانی‌یەکی هەمەگیرانە لەلایەك، وە لە هەمان کاتیشدا بە شێوەیەکی ناچوون یەك و جیاواز کەوتەوە. یەکەمین ناوەندەکانی کەڵەکەکردنی سەرمایە لە بەریتانیاو هۆڵەندا، کارگەری‌یەکی دوولایەنەیان لەسەر باقی گۆی زەوی جێهێشت. ئەم دوو وڵاتە دەستیان گرت بەسەر تەواوی ئەو وڵاتانەدا کە پێشتر کەوتبوونە ژێر نفوذیانەوەو سەرەنجام دووچاری هەژاری‌و برسێتیان دەکردن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەو وڵاتانەیان بە تۆڕێکی جیهانی بە پەیوەندی‌یەکانی بازاڕەوە دەبەستەوە، لە دواجاریشدا خوازیاری دەرکەوتنی ئەو چینە ناوەندی‌یە تازانە بوون کە ئاییندەی خۆیان بە ئاییندەی سەرمایەداری‌یەوە گرێ دەدەن.

بەڵام ئەم زا گروپانە خۆیان لە دنیایەکدا بینیەوە کە لە چرکەساتی ئێستادا لەژێر سایەی دەوڵەتانی سەرمایەداری‌دان، وە دەوڵەتە نەتەوەیی‌یەکان لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندی‌یەکانی خۆیاندا بەکاردەهێنن. ئەگەر بڕیار بێت کە ئەم ناوەندە تازانەی سەرمایەداری لە سنوورە دیاریکراوەکان تێپەڕی‌و ئەولاتر چێ، ئەوا پێویستیان بە دەوڵەتانێکی خۆیی وەها هەیە

کە لەپێناوی بەرژەوەندی‌یەکانیاندا بجەنگن. لەم ڕووەوە بوو کە چاوی هیوای بەرژەوەندی‌یە بازرگانی‌یەکانی فەڕەنسا بە دەوڵەتێکی ڕەهای ئۆرۆستۆکراتی بوو کە لە دڵی فیئۆدالیزمەوە هەڵقوڵا بوو، تا لەپێناوی ئۆتۆریتە (نفوذ)ی جیهانی فەڕەنسادا لەگەڵ بەریتانیادا بجەنگێ؛ لە هەمان ڕووەوە بوو کاتێ کە بازرگانان و خاوەن زەوی‌یە گەورەکانی کۆلۆنیەکانی باکووری ئەمەریکا سەرپێچی یان لە یاساکانی دەوڵەتی بەریتانیا کردو دەستیان بە دارشتنی بنەماکانی دەوڵەتی خۆیان کرد. هەروەها بەرزکردنەوەی دروشمی ((مافی)) سەربەخۆیی لە بەریتانیا لەلایەن چەند بەشێك لە چینی ناوەندی دبلن و بەلفاستەوە دیسان هەر بۆ هەمان هۆ دەگەڕێتەوە.

ئەوان کە چاویان بڕیبووە پێکهاتنی دەوڵەتە نەتەوەیی‌یە تازەکان، تا بە یارمەتی ئەوان بەرژەوەندی زیاتر بەدەست بێنن، نەیاندەتوانی کە سەدەها ساڵ چاوەڕێ بن تا گەشەی خۆبەخۆی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی ببێتە هۆی پێکهێنانی ئەم جۆرە لە دەوڵەت. ڕێگای چوونەپێشەوە، لەلایەکەوە- لانی‌کەم بەشێکی-بەهۆی ئەو دەوڵەتە سەرمایەداری‌یانەی کە بە واقعی هەبوون بەتایبەتی بەریتانیا، وە لەلایەکی‌تریشەوە بەهۆی دەوڵەتە ڕەها کۆنەکانی پێش سەرمایەداری‌یەوە ڕێگای لێگیرابوو. هەتا لەپێناوی کێبەرکێ‌و هاوشان وەستانەوە لەگەڵ بەریتانیادا - ئەوا قسە لەسەر لە مەیداندا کردنە دەرەوەی هەر مەترەح نەبوو- کردەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی هۆشیارانەی پێویست بوو- کارێکی شۆڕشگێڕانەی وا پێویست بوو کە خاوەنی بزوێنەرێکی ئایدۆلۆژی بێت، کە لانی کەم هەتا ئەگەر بە شێوەیەکی لێڵ و ناڕۆشنیش بێت هەروەك کە واشبوو، خاڵە بنەڕەتی‌یەکانی جۆرە دەوڵەتێکی لەو چەشنەی کە بڕیار بوو پێك بێت بخاتە ڕوو.

لەم ڕووەوە شۆڕشگێڕە فەڕەنسی‌یەکان بە ڕاگەیاندنی ((کۆماری فەڕەنسای‌یەك پارچەو لە دابەشکردن نەهاتوو)) لە هەموویان زیاتر چوونە

پێشەوە- ئەوان بە سوود وەرگرتن لە ستەم و زۆرداری دابەشکردنی ئیداری‌یەکانی پێشوو، بە باج و سەرانە جۆراوجۆرەکانیانەوە، بەهۆی دەزگایەکی ئیداری ناوەندی‌یەوە کە لەلایەن ئەو بەڕێوەبەرە هەڵبژێردراوانەوە کە لەلایەن حکومەتەوە ئاراستە دەکران، جێگایان گیرایەوە. شۆڕشگێڕانی فەڕەنسایی بە سەپاندنی ئێستاندارێکی شارستانی یەکگرتوو، کە داوای وەفاداری لە هەموو کەسێك دەکرد، دەست پێشخەرییان کرد. وەفادارى بەیان کردنی خۆی لە بە زۆر سەربازی‌کردنی لاواندا دەبینیەوە، کە دەبوو لە پێناوی ((نەتەوەی چەکداری)) خۆیدا بجەنگێت. یەکەم سیستەمی یەکگرتووی نەتەوەیی پەروەردە هێنرایە ئاراوە، کە لە پێناوی بڵاوکردنەوەی یەك زمانی یەکگرتووی نەتەوەیی‌دا لەجێگای دیالیکتە ناوچەیی‌یەکانی نیوەی باشووری فەڕەنسا، برتوونی ناوچەی ڕۆژئاواو زمانی پێکهاتوو لە زمانە ئەڵمانیەکانی سنووری باکوور، بەکار ببرێت.

ئەوەی کە فەرەنسی‌یەکان بە ئەنجامیان گەیاند، بووە مۆدیلێك بۆ ئەو دەوڵەتە نەتەوەیی‌یانەی کە لە هەر شوێنێکی ئەم دنیایەدا، لەپێناوی تەکامولْ پێدانی ((مۆدێرنانە)و سەرمایەدارانەی کۆمەڵگادا چاوی لێ بکەن. زۆری بەسەردا نەڕۆیشت کاتێك کە لاوانی شۆڕشگێڕ لە ئێرلەندا، ئەمریکای لاتین، یۆنان، ئیتالیا، ئەڵمانیا، پۆڵەندا، هەنگارياو ئیسپانیا، دەستیان بە فۆتۆکۆپی‌کردنی ئەم ئەزموونەی فەڕەنسا کرد. بە دەست پێکردنی سەدەی بیستەم ناسیونالیستە کۆپیەکراوەکان لە ناوچەی چیك زمانی نەمسا • هەنگاريا، بالکان، بەشی ئاسیای تورکیا، چین، هیندستان، ئۆکرانیا، بەشی قەفقازی ڕووسیا، شکڵیان گرتبوو. نیو سەدە دواتر شایەتی پەرەگرتنی ناسیونالیزمین لە ئیمپراتۆریەتی‌یەتەکانی بەریتانیاو فەڕەنسادا- کە بە هەردووکیان تەواوی ئەفەریقیاو زۆربەی باشووری ئاسیاو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان خستبووە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە.

# نەتەوە، زمان و ئایین

نەتەوە تازەکان بە پێچەوانەی نەتەوە کۆنەکانەوە، دەستکەوتێکی
هۆشیارانە بوون. بزووتنەوە نەتەوەیی‌یەکانی ئیتالیا، ئەڵمانیا، یۆنان
چیك، هیندستان و ئەندەنوسیا، زۆر کۆنتر بوون لە پێکهاتنی خودی لە
دەوڵەتانە (لەم وڵاتانەدا). لەکاتێکدا سەبارەت بە دەوڵەتە نەتەوەیی‌یە
کۆنەکان، واتە ئینگلستان، فەرەنسا، ئەمەریکا، مەسەلەکە جیاوازە
بەوۆکەی نەتەوە ڕێك هاوکات بوو یاخود تەنانەت پاش پێکهاتنی خودی
دەوڵەتی نەتەوەیی شکڵی گرت. لە هەر ڕوویەکەوە سەیری بکەی بە
شێوەیەکی گشتی بنیاتنەرانی نەتەوە تازەکان لەچاو پێشینەکانیاند
جێگایەکی دژوارتریان هەیە. ئەوانە نەتەنها دووچاری ڕاوەدوونانی
شەڕەنگێزانەی سەرۆکایەتی ئەو دەوڵەتانە ببونەوە، کە دەبوایە جێنشینیاز
بوونایە، وە یان چاکیان بکردنایە، بەڵکو هەر لە بنەڕەتەوە کەرەسە خاوەک
یاخود ئەو خەڵکەی کە دەبوایە بە کۆمەکی ئەوان دەوڵەت پێکهێنرێ هێشتا
ئامادەگی پێویستیان نەبوو. چەندەها سەدەی درێژ پێویست بوو، کە لە
چوارچێوەیدا سەرمایەدلری لە باکووری ڕۆژئاوای ئەورووپادا تەکامول
کرد- و هەروەها بۆ باکووری ئەمریکاش بەڕییەوە- تا لەناوچە جوگرافیە ت
ڕادەیەك گەورەکاندا زمانە یەککگرتووەکان زاڵبن. لە زۆربەی ناوچەکانی
ئینگلستان و بەشێك لە ئۆسکوتلەندەدا، لە زۆربەی ناوچەکانی فەرەنسا، وە
تەنانەت لە ئەڵمانیادا لە دەرئەنجامی سەرکەوتنی لۆثە ردا لە پێکهێنانی
کلێسایەکدا کە یەك شێوە زمانی ناوچەیی یەککگرتوویان بەکاردەهێنا، زمانە
یەککگرتووەکان کۆمەڵایەتی بوونەوە. بە پێچەوانەوە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی
ئەورووپادا، لە ئاسیاو ئەورووپادا درەنگ دەرکەوتنی سەرمایەداری بەو مانایە
بوو کە کاری یەکبوونی زمانی ناوچەیی‌یەکانیش درەنگ دەست پێدەکات.
لەم ناوچانەدا) هێشتاش هەر بەتەواوەتی شتێکی زۆر ئاسایی بوو
هەروەك ئەوەی کە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست بە خۆیەوە دیبووی:

لــە دام و دەزگــا دەوڵەتیــەکاندا زمــانێك بــەکار دەبــرا، کڵێســاکانیش زمانێکیتریـان هـەبوو، زەویداره ناوخۆییـەکانیش زمـانێکی سـێهەمیان هەبوو، جووتیارانیش زمانێکی تایبەتی خۆیان هەبوو، وە زۆربەی خەڵکی شارەکانیش بە زمانی پێنجەم قسەیان دەکرد.

بەهۆی ئەمەوە بوو کە لە هەر بەشێکی بالکاندا، زمانی کڵێسا زمانێکی مردووبووە- لاتین، زمانی سلاڤی کڵێسایی کۆن، یۆنانی کۆن و یان عەرەبی کلاسیك، زمانی دام و دەزگاکانی ئیدارەی ئەڵمانی، چیك، تورکییان یۆنانی بوو؛ زمـانی جووتیـاران یـەکێك لـە دیالیکتـەکانی سـلاڤییان هـەندێك جـار دیالێکتێکی هەنگاری یان ڕۆمانی بوو؛ وە لـە شارەکانیشـدا خەڵك بە زۆری بـە یـەکێك لـە دیالکتـەکانی زمـانی ئـەڵمانی قسـەیان دەکـرد. لـە هـەموو ئەمانەش واوەتر زمانی جووتیاران لە گوندێکەوە بۆ گوندێکیترو تەنانەت لە هەندێ بواردا لە خێزانێکەوە بۆ خێزانێکیتر لە دێیەکدا جیاوازبوو.

تا ئەو شوێنەی کـە شـێوازەکانی بەرهـەم هێنـانی پێـش سـەرمایەداری بالادەست بـوو، ئـەم هـەل و مەرجـە گرفتێکـی گـەورەی دروسـت نـەدەکردو جووتیاران تا ڕادەیەکی پێویست زمـانی ئیـدارات و شـارەکانیان دەزانـی تـا لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەو گفتوگۆیاندا لەگـەڵیاندا تووشـی کێشـە نـەبن؛ وە لــە ڕاسـتیدا لــە دووتــوێی ئاخــاوتنێکدا، بــە زۆریو بــەپێی جێگــاو شوێنەکەی، لە یەك زمان وە یان لە دیالەکتێکی ئەو زمانە بەبێ هیچ گرفتێك دەیانگواستەوە بۆ زمان یاخود دیالکتێکیتری جیاواتر لەو زمانەو قسـەیان پـێ دەکـرد. ڕەنگـە ئـەم جووتیارانـە تـا ڕادەیـەکی ئیسـتانداری جێگـای پەسـەندکردن لە تاقیکردنەوەیـەکی زمـاندا، شارەزاییان لـە هیـچ یـەکێك بـەم زمانانەدا نەبێت (بەتایبەتی نووسین بەم زمانانە)، بەلام دەتوانن بەبێدەست گەیشتنیان بە ئیستانداردێکی لەو جۆرە، پێویستییەکانی خۆیان بەدەست بێنـن. فراوانـی زمانـەکان و شێوە زمانـەکان بۆ ناسیونالیستە نوێخوازەکـان مایـەی دەردەسـەری و گرفتـاری بـوو. ئـەوان ئامانجیـان گەیشـتن بـوو بـە زمانێکی یەکگرتووی چوون یەك - لە هەردوو ڕووی قسەو نووسـینەوە-.

ئـەم خاڵـە لـەپێناوی پێشـکەوتنی کاروبارەکـانی بـازاڕو دەوڵـەتێکی هاوچەرخدا پێویست بوو. تەنها ڕێگایەك کە ئەوان بەو ئامانجە بگەیەنێ، هەڵبژاردنی یەکێك لە زمانـەکانی ئاخـاوتن و ڕاگـەیاندنی بـوو وەك زمـانی ((نەتەوەیی))، کە پێویستە هـەمووان، نـەك تەنها قسـەی پـێ بکـەن، بەڵکوو پێشی بخوێنن و بنووسن.

هەڵبژاردنی زمانێکی هەمیشەیی بە تەواوەتی دڵخوازانە بوو. پەرەگرتن و فراوان بوونـی سـەرمایەداری هەرچەندە هێواش و لەسـەرخۆیە، بـەڵام بـە ڕێژەی ئـەم مانایـەی دەگـەیاند کـە چـەند بەشـێك لـە کۆمـەڵگای کشـتوکاڵی پێشوو لە پەیوەندییەکی بەردەوامدابوون لەگـەڵ بەشـێك لـە دانیشـتوانی شـارەکاندا، کە شـێوە زمانەکـەیان لـەپێش هـەموو شـێوە زمانـەکانیترەوە کـاری تێدەکـرا. بـۆ نموونـە لـە پرلگـی سـەرەتای سـەدەی نـۆزدەدا، ووردەبرژوازی لە حاڵەتێکی پێگەیشتن و کامڵ بوونی وادابوو کە دەیتوانی وەك ئەڵقەیـەکی نـاوەندی جـێ‌ی بایـەخی ناسیونالیسـتەکان لەگـەڵ جووتیاراندا بێت لەگەڵ هـەموو ئەمانەشـدا هەمیشـە فاکتـەرێکی گرنـگ و بەدەسەڵات ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە هەڵبژاردنی زماندا بۆ نموونە ئەوکاتەی کە سەرەنجام ناسیونالیستەکانی ئیتالیا شێوەزمانی توسکانییان (کە تەنها لە سەدا دوو نیـوەی خـەڵکی نیمچـە دوورگەکـە قسـەیان پـێ دەکـرد) وەك زمـانی ((نەتـەوەیی)) دانرا. یان ئـەو دەمـەی کـە ناسیونالیستەکانی هینـد ڕایانگـەیاند کـە ئەگـەر شـێوە زمـانی ناوچـەیی دەلـی (هیندوسـتانی) لـە زاراوەکانی زمانی فارسی پاك بکرێتەوە، دەکرێت وەك زمـانی ((نەتـەوەیی)) بـەکار بهێنرێت، یـان کـاتێك کـە ناسیونالیسـتە سـلاڤیەکانی باشـووری دانیشتووی ڤییەننا، بیرۆکەی سوود وەرگرتنیان لە زمانی سلاوانێکی کۆنی کلێسایی وەك زمانێکی نەتەوەیی ڕەت کردەوە، لە بەرامبەردا شێوە زمـانی ئیسـتوکاڤینیان (زمـانی بەشـێك لـە کرواتـەکان و سـربەکان، بـەڵام نـەك هـــەردووکیان)) لـــــە جێگـــــای‌دا پەســـــەندکرد، وە بـــــەناوی ((سرب و کرواتەکانەوە)) ناوی متمانەیان بەسەردا ڕشت(١٠).

بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە کام زمان دەبێت زمانی نەتەوەیی بێت، تەنها دەسپێکی ڕووداوەکە بوو، پاشتر دەبوو خەڵك بارێنن کە پەسەندی بکات. لەم بوارەشدا، نەتەوە تازە بە ڕێکەوتووەکان ئابووریی لاوازو دواکەوتووەکان، بە بەراوورد لەگەڵ ئەوانەی پێشوویاندا، کێشەو گرفتی زۆرتریان هەبوو. لەبەر ئەوەی لەو جێگەیەی کە گەشەی سەرمایەداری بە سەرکەوتن گەیشتووەو توانیویەتی بازاڕ بۆ جووتیاران و بۆ دانیشتوانی ڕوو لە زیادی شارەکانیش کارو بژێوی دابین بکات، گرفت نەبوو بەلایەوە کە هانی خەڵك بدات کە لە بەکارهێنانی زمانێکی یەکگرتووی نەتەوەیی خۆیان نەدزنەوە. لە فەرەنسادا زۆربەی ئەو کەمە نەتەوەییانەی کە بە زمانی فەرەنسی قسەیان نەدەکرد شۆڕش و نەتەوەیان بە شادمانییەوە پەسەند کرد، چونکە وا دەهاتە بەرچاو کە بۆ ئەوان ژیانی باشتر بە دیاری دەهێنێ. لە ئەمریکا ئەوە لە دوای ئەوەی ئەو کۆچەرانەی کە تەنانەت زمانیشیان ئینگلیزی نەبوو، نەتەوە تازەکەیان - هەتا ئەگەر بە باشیش قسە بە زمانەکەی نەکەن- بە لایانەوە ئازیز بوو. بەڵام لە ئیسپانیا بە پێچەوانەوە بوو، کاتالۆنەکان قسەکردنیان بە زمانی کاستیلەکان و ئەندەنوسیەکان کە لە ڕووی ئابوورییەوە پاشکەوتووتر بوون، پێ پەسەند نەبوو. لە ڕۆمانیادا چیکەکان و ساکسۆنەکان پێیان لەسەر بەکارهێنانی زمانی دایکی خۆیان دادەگرت. لە ئێرلەندەدا هاندان و بەڵێنەکانی دەوڵەت نەیتوانی وا لە خەڵکی ڕۆژئاوای دوور بکات کە لە بەکارهێنانی زمانی گیلیك بۆ بەرژەوەندی زمانی ئینگلیزی (کە لە ڕووی ئابوورییەوە بە سوود نەبوو) چاو بپۆشن؛ وە لە هندوستاندا، خەڵکی ناوچەکانی باشوور لە بەکارهێنانی زمانی هیندی باکووریدا خۆیان دەپاراست.

نەتەوە دواکەوتووەکان لە ڕەوتی گەشەکردنیاندا لە مەڕ مەسەلەی ئایین دووچاری گەلێك گرفتی هاوشێوە بوون. مۆدێلی ناسیونالستەکان بە ڕاشکاوی و توندی مۆدێلێکی نائایینی (سکولار) بوو. لەبەر ئەوەی ئایین بەرهەمی کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداری بوو، ئەو کۆمەڵگایانەی

کە ئەوان هەوڵی گۆڕینیان دەدا. ئەم مەسەلەیە ئەوانی ناچار بەدانی گفت و بەڵێنی وا دەکات کە لە سایەیدا سەرتاسەری سنوورەکانی دەوڵەت کە بەلای ئەمانەوە گرنگە، بچێتە ژێر چاودێرییانەوە. ئەم کارە بە زۆری ئەو خەڵکەی کە ئەمان لە هەوڵی پێکهێنانی یەك پێناسەی هاوبەشدا بوون بۆیان، دووچاری لێك دابڕین دەکات. لەم ڕووەوە بوو کە ناسیونالیستەکانی سلاڤی باشوور لە سەدەی نۆزدەدا خوازیاری یەکێتی کاسۆلیکە ئەرسەدۆکسەکان و موسوڵمانەکان بوون؛ ناسیونالیستەکانی هیند داواکاری یەکێتی بوون لە نێوان هندۆسەکان و موسوڵمانەکاندا؛ ناسیونالیستەکانی ئێرلەندا یەکێتی نێوان کاثولیکەکان و پرۆتستانتەکانیان دەخواست؛ وە ناسیونالیستەکانی عەرەبیش خوازیاری بەدیهاتنی یەکێتی نێوان موسوڵمانەکان و مەسیحیەکان بوون.

لەگەڵ ئەم هەموو ڕاستیانەشدا، بەڵام بە زۆری مەیلێك هەیە کە لە بەرامبەر ئاییندا سازش دەکات، تا بتوانێت لە نێو خەڵکی جووتیاردا کە هێشتا لە بازاڕو پلانەکانی مۆدێرنیزەکردن دوور بوون و زمانی نەتەوەییان هێشتا نەدەزانی، جێگاو شوێنێکی شیاو بەدەست بێنن. لەم ڕووەوە بوو کە ڕابەرانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی ئێرلەندا هەمیشە قسەکردن لەبارەی سکولاریزمەوە لەگەڵ ئەو هەوڵانەی کە بە مەبەستی ڕاکێشانی، لانی کەم، پشتیوانی‌یەکی سنوورداری کڵێساکانی کاثولیك، تێکەڵاو دەکەن. جەماوەری‌ترین سمبوڵی کۆنگرەی نەتەوەیی هند، واتا گاندی، تێدەکۆشا تا بە لەبەرکردنی پۆشاکی قەدیسێك بیێتە جێی متمانەی خەڵکی هندستان، وە میشێل عفلق، دامەزرێنەری پارتی نەتەوەیی عەرەبی بەعث، لە کۆتایی‌یەکانی ژیانیدا بوو بە موسوڵمان.

ئەو کێشانەی کە لەمەڕ مەسەلەی زمانی نەتەوەیی‌و سازش کردن لەگەڵ ئاییندا سەرچاوەیان دەگرت، کاریگەری‌یەکی گرنگیان لەدوای خۆیان بەجێ دەهێشت. بنیاتنەرانی ناسیونالیزم بەزۆری خۆیان پەیوەست بە گروپێکەوەو دژ بە گروپێکی‌تر نەدەناساند، ئەو شتەی کە ئەمڕۆ

بە دروستی ناوی ((پاکسازی نەتەوەیی)) لە خۆی ناوە، قبوڵ نەدەکرا.
ئامانجی ئەوان یەکسخستنی خەڵکانی یەك ناوچەی دیاریکراو بوو، تاکو بتوانن ئەو شوێنە بەپێی تێگەیشتنی سەرمایەدارانەی ووشەکە ((مۆدێرنیزە)) بکەن. لە حاڵەتی پێویستدا ئامادە بوون تا زمان یان رۆشنبیرییەکی دیاریکراو بە زۆر بەسەر خەڵکدا بسەپێنن، هەروەها ئامادەش بوون تەواوی هێزو دەسەلاتی دەوڵەت لەدژی ئەو کەسانە بەکار بهێنن کە بەرگری دەکەن– بەو شێوەیەی کە شۆڕشی فەرەنسی لە بەریتانی، و یان دوو هێزی بورژوازی ئینگلیزیو ئۆسکتلەندی شان بە شانییەك لە ناوچە شاخاوییەکانی ئۆسکوتلەندەدا کردیان. بەلاَم بە هەر حاڵ ئامانجی ئەوانە یەکگرتووکردنی تەواوی خەڵك بوو، نەك سوود وەرگرتن لە لە بەشێکیان دژ بە بەشەکەیتریان.
لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ناسیونالیستەکانی سەرەتا بە هەڵبژاردنی دیالێکتی کەمە نەتەوەیەك وەك زمانی ((نەتەوەیی))، و یان پەسەندکردنی ناسنامەیەکی دیاریکراوی ئایینی، لە ئامانجە بنەڕەتیەکەی خۆیان دووری دەخستنەوە. لەم حاڵەتەدا بزووتنەوەی نەتەوایەتی تەنها لە نێو بەشێك لە خەڵکدا دەیتوانی جێگاو شوێنێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە، نەك لە نێو تەواوی خەڵکدا؛ لەم حاڵەتەدا ئەوەی پێویست بوو بە ئاسانی جێگیر دەبوو– بەهۆی ئەمەوە بوو کە خەڵکی ئەڵمانیا زمانی خۆیان لە خەڵکی چیك جیاکردەوە، پرۆتستانەکان لە خەڵکی ئێرلەندا، موسوڵمانەکان لە خەڵکی هندستان، کاسۆلیکەکان و موسوڵمانەکان لە خەڵکی سربستان.

# بنەمای چینایەتی ناسیونالیزم

ناسـیونالیزم وەك بەشـێك لـە ئایدۆلۆژیـای تـەكامولی سـەرمایەداری، گەشەی كردووە. چەمكی نەتەوە لە زنجیرەیەك بۆچوون و بیروباوەڕیتر كە لەگـەڵ شۆڕشـی بـورژوازیدا هاوكـات بـوون، جیاناكرێتـەوە. ئەگـەر ناسیونالیزم جیهانی كۆنـترۆڵ كـردووەو ئەگـەر بـە نێوچـەوانی هـەر تاكـە كەسێكی جیهانی ئەمڕۆوە خۆشەویستی ئەم یان ئەو ناسنامەی نەتـەوەیی دەخوێندرێتەوە، لەو ڕووەوەیە كە سەرمایەداری جیهانی كۆنترۆڵ كردووە.

ئەمە بەو مانایە نییە كە پێشەنگانی ناسیونالیزم، خۆیـان بـە كـردەوە سەرمایەدار بوون. هەڵبەتە كە نموونەی لەو جۆرەش هەیـە. بـۆ نموونـە، یەكـەمین حـیزبی ناسیونالیسـت لـە كاتالۆنیـا، واتـە لیگـا، حـیزبی سەرمایەدارانی كەتالۆن بوو(١١). بە شێوەیەكی گشتی ئەوانەی كە گەشەو بزاوتیان بە ناسیونالیزم بەخشیوە، چەند بەشێكن لە چینی ناوەندی تـازە پێكهاتوو كـە بەدەسـت دواكـەوتوویی و ركـودی كۆمەڵگاكەیانـەوە، ڕەنـج و ئازارێكی زۆریـان چێشتووە. ئەوانە تەنها ڕێگاچارە لەوەدا دەبیننـەوە كـە وولاتەكەی خۆیان بگۆڕن بەیـەك ((نەتـەوە))، وەك هـەر نەتەوەیـەكیتر، وە ئەوان لەپێناوی پێشكەوتنی ئابووریدا بەكاربهێنن. لەو شوێنەوە كە هـەر نەتەوەیەكیتریش سەرمایەدارین، لە ڕاستیدا ئەم ڕێگاچارەیە لەو شوێنەدا كۆتایی دێت كە تەكامولی سەرمایەدارانە پەسەند دەكات؛ هەرچەندە كە ئەم ڕێگاچارەیـە ڕەنگێكـی زیوینـی لـە تایبەتـمەندیو كـارە پۆزەتیڤـە شێوە باوەكانی ژیـانی لـە خـۆ پێچابێت: ڕەنگـە هـاندەری ناسیونالیستە ئێرلەندییەكان لە یـەك سەدەی ڕابردوودا، ئەمـە بووبێـت، بـەڵام بەرنامـەی دامەزرێنـەری شین فین (باڵی سیاسـی سـوپای كۆمـاریخوازی ئێرلـەندە–و:ك) و ئـارتۆر گریفیـتر پێكـهێنانی ((یـەڵە مانشسـتر گیلیـك)) بـووە:(١٢) لەوانەیـە گـاندی لـە ڕووی دانایییـەوە ئامۆژگـاری لەبـەركردنی پۆشاكی چنراوی دەستی ماڵانی كردبێ، بەڵام حیزبی كۆنگرەكەی لەلایەن گەورە سەرمایەدارانی هندیەوە پشتیوانی لێ دەكرا، پێكهێنانو داهێنـانی

پیشەسازی گەورە خاڵی ناوەندی بەرنامەی ئابووری ئەو حیزبەی پێك دەهێنا؛ لە کینیا، نکرومە بە بایەخ وگرنگی یەکی زۆرەوە باسی ((کۆمۆنالیزم))ی ئەفریقیایی دەکرد، بەڵام لەگەڵ گرتنە دەستی دەسەڵاتی دەوڵەتی‌دا، دەست پێشخەری لەپێناوی بنیاتنانی پیشەسازی مۆدێرندا کرد(١٣).

ناسیونالیستەکان بە زۆری لەنێو ڕۆشنبیرانی چینی ناوەندا - شاعیران، شانۆنووسان، مامۆستایان، یاساناساندا- سەرهەڵدەدات، تا لەنێو سەرمایەدارانی گەورەدا. بەڵام بەرنامەی ئەوانە پشتی بە هاندانی سەرمایەداران بەستووە. تەنانەت ئەگەر گەشەی سەرمایەداری وا پێویست بکات، ناسیونالیستەکان بەشێکیان، بە دامەزراندنی پیشەسازی تازەی خۆماڵی‌کراو، دەگۆڕێن بە سەرمایەدارانی دەوڵەتی. ناسیونالیستەکان پێش ئەوەی بتوانن هەنگاو گەلێکی لەو چەشنە بنێن، پێویستە لە هەموو کۆمەڵگادا قورساییەك بۆ خۆیان بەدەست بێنن. خودی چینی ناوەڕاست، یان باشتر وایە بڵێین چەند بەشێکیان، بەشێکی گرنگی ئەم قورساییە بوون. دواکەوتوویی کۆمەڵگە، بەتایبەتی لەکاتێکدا کە دەسەڵاتی دەوڵەتی لە دەستی چینی دەسەڵاتداری پێش سەرمایەداری‌دایە یان لەدەستی هەندێك دەوڵەتی نەتەوەیی لە حاڵی حازردا هەبووی دەرەکی‌دا بن، خۆی لە کەمبوونی ئیمکاناتی کارکردن بۆ چینی ناوەڕاستی خوێندەوار، نیشان دەدات. سەرەنجام ڕێگاچارەی بەدیهی بۆ باشتربوونی هەل و مەرجی ژیانی تاکەکانی چینی ناوەڕاست، خەباتی ئەوانە لەپێناوی بەدەست هێنانی مافی کارکردن لە دەزگا دەوڵەتی یەکاندا ( وە ئەگەر زمان بوو بە کێشەیەك، خەباتکردن لەپێناوی سوودوەرگرتن لە زمانی خۆیی)، هەتا لەوەش زیاتر، خەبات لەپێناوی گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە لە ئامرازی دەوڵەتی‌داو کۆنتڕۆڵی ((نەتەوەیی)) بەسەری‌دا بووە.

دوکاندارە بچوکەکان، بورژوازی بازرگانی‌و پیشەگەرانی بچوکیش بە هەمان شێوە لە پشت سەری ڕەوتی ناسیونالیستی‌یەوە ڕادەوەستن. ئەوانە

ئەوانە توانای بەدەستهێنانی ئیمتیازاتی تایبەتی نەبوون لە دەزگای دەوڵەتی پێش سەرمایەداری، وە یان لە دەوڵەتانی دەرەکی لەکاتێکدا سەرمایەی گەورە تا ڕادەیەك توانای ئەم کارەی هەیە. پێکهێنانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی تازە ئەوانیشی لە بڕیارە سیاسیو نەخشە حکومیەکاندا کردۆتە خاوەن نفوذ، و هەروەها پشتیوانی لە بازاڕیش دەکرێت.

سەرەنجام، جووتیاران و چینی کرێکاری نوێش هەمیشە لە پشتیوانە چاوەڕوانکراوەکانی نەتەوە بوون. بۆچی نا کە ئەوان لە دواکەوتوویی گشتی کۆمەڵگا زیان بارن، و دووچاری سوکایەتی پروپاگەندە (تبلیغات)ی ناسیونالیستی دەتوانێت وەك ناوەندێکی ناڕەزایەتی دەربڕینی خەڵك لەنێودا کار بکات و چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا بەرەو مەیدانی تێکۆشان رابکێشێ.

بەڵام ناسیونالیستەکان لە پشت بەستنیاندا بە کرێکاران و جووتیاران هەمیشە ڕووبەڕووی کێشەیەك بوونەتەوە. بێزاری ئەوان بە تەواوەتی لەبەر شێوازەکانی چەوساندنەوەی پێش سەرمایەداری، یان چۆنێتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتی کۆنی پێشوو نەبوو، ئەم بێزاریو ناڕەزایەتیانە لە هەمان کاتدا، لە شێوازی تازەو لە حاڵەتی پەیدابوونی سەرمایەداریدا سەرچاوەی دەگرت - کە لە سەروویانەوە بە زۆری ((سەرمایەدارانی نەتەوەیی)) تازە ڕاوەستاون - و ئیمتیازاتی ((چینی ناوەندی نەتەوە))ش بوو. بزووتنەوەیەکی کرێکاریو جووتیاری کە بە دژایەتی لە بەرامبەر دەسەڵاتداران و چەوسێنەرانی کۆندا دەست پێ دەکات، دەتوانێ بە ئاسانی ڕووبەڕووی چەوسێنەرانی تازەش ببێتەوە، ڕووبەڕووبوونەوەیەك کە دەیتوانی تەواوی نەخشەکانی ڕابەرانی ناسیونالیست بکاتە نەخشەی سەرئاو. لەم ڕووەوەیە کە مێژووی بزووتنەوە نەتەوەییەکان بە زۆری هاوکات بەسەردەمانێك لە پروپاگەندە لەناو کرێکاراندا دەستی پێکردووە؛ بەڵام ئەم سەردەمانە هەتاکو تەنانەت

بە نرخی لادانی خودی بزووتنەوەی نەتەوەیی لە کاروانی ئەوان، بە زۆری بە پاشەکشە کردنێکی خێرا بە ئاراستەی هاوڕایی لەگەڵ بەرژەوەندی چینە دەوڵەمەندەکانی ((نەتەوە))دا بە کۆتایی خۆیان دەگەن.

لەم گۆشەیەوەیە کە دەتوانرێ خیانەتەکانی ئاڵمان لە ساڵی ١٨٤٨-١٨٤٩دا، ئێرلەندا لە ساڵی ١٩٠١-١٩٠٢دا، و یان چین لە ساڵی ١٩٢٥-١٩٢٧، هەڵسەنگێنین.

بزووتنەوەی کرێکاری لەوانەیە بتوانێت بۆ ناسیونالیستەکان، پشتیوانییەکی کاتی بێت، بەلام ناتوانرێت لە ستراتیژیەتی ئەواندا بە قورسایییەکی جێ متمانەو جێگیر بژمێردرێت. لەم ڕووەوە پێویستە ناسیونالیستەکان پشت بە چەند بەشێك لە بورژوازی یان وردەبورژوازی ببەستن.

## بزووتنەوە نەتەوەیی یە کۆنەپەرستەکان

بزووتنەوە نەتەوەییە کلاسیکیەکان، وەك بەشێك لە شۆڕشی بورژوازی ئەورووپاو ئەمریکا لە سەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا ڕووناکی بینی. پاشتر زۆربەی بزووتنەوە نەتەوەییەکان بە خەباتی خەڵکی کۆلۆنیەکان لەپێناوی ڕزگاری لە هەژموونی فەرمانڕەوایانی ئیمپریالیستیدا لەدایك بوون. تا ئەم ئاستە، ئەم بزووتنەوانە شۆڕشگێرانە بوون لەدژی دام و دەزگاکانی دەوڵەتی ستەمگەری سەرکار (موجود)- هەتا ئەگەر سەرەنجام ئامانجیان ئەوە بوو کە دام و دەزگایەکی دەوڵەتی ستەمکەرانەی نوێ لە جێگای ئەم دەوڵەتانەدا دابنێن.

بەلام لە هەمان دەستپێکەوە، بزووتنەوە گەلێکی وا سەریان هەڵدا، کە سەرەڕای هەڵگرتنی هەندێ نیشانەی ((نەتەوەیی)) بوونی دیاریکراو، لە خزمەتی پاراستنی دام و دەزگای دەوڵەتی کۆندا بوون، نەك تێکدان و ڕووخاندنی. بزووتنەوەی خەڵکی ناوچە شاخاوییەکانی ئۆسکۆتلەندا،

ـلاڤیەکانی دانیشتووی‌ئیمپراتۆریەتی نەمسا-هـەنگاریا کـە بـە درێژایـی
ئۆڕشەکانی ساڵی ١٨٤٨ دەرکەوتن، خۆیـان وەك بەشێك لـە جموجۆڵێکی
ێشتی‌تری ناسیونالیستی نیشان دا.

ئامانجی ڕابەرانی ئەم بزووتنەوەیە پێکهێنانی هەندێ ناوچەی نەتەوەیی
ایبـەت بـوو بـۆ چیکـەکان، ڕووتەنـەکان (ئۆکرانیـەکانی ڕۆژئـاوا)، و
ـلاڤیەکانی باشـوور (نـاوێکی هاوبـەش بـوو بـۆ سـربەکان، کرواتـەکان و
یسلوانەکان بەڵام بێجگە لە چەند بەشێك لە چیکە بووهیمیایەکان، زۆربەی
ەم خەڵکانە لە ڕووی ئابووری‌یەوە، جووتیارانێکی دواکەوتوو بوون کە بە
ەندێ دیالێکتی ئاڵۆزو قابیلی تێنەگەیشتن لەگەڵ یەکتردا قسـەیان دەکرد،
 بیرۆکەی هەر جۆرە پەیوەندی‌یەکی هاوبەشی نەتـەوەیی لەنێوان ئەوانـەدا
ەنها لەناو ژمارەیەکی دیاری‌کراوی ڕۆشنبیرانی شاری‌دا برەوی هەبوو.

کێشکردنی ئەم خەڵکە جووتیارە بۆ ناو جەنگێك لەپێناوی هەڵتەکاندنی
اب و نەریتە دواکەوتووە ئابووری‌و بیروبـاوەڕە کۆنـە ناوچەیی‌یـەکان، بـە
ـێوازێکی‌تر لـە یـەکێتی نەتـەوەیی، نـەدەکراو ئیمکـانی نـەبوو. بـەڵام
اچـارکردنی بەشـێکیان بـە بینینـی ڕۆڵـی برتونـەکان و باسـکەکان دەکـرا
جیٰبەجیٰ بکریٰ- تـا لـە بەرگری‌کردندا لـە سیسـتەمی کۆنـی فیـۆدالی، لـە
ەرامبەر هێرشـەکانی ناسیونالیسـتەکانی ئـەڵمانی‌و هـەنگاری‌دا لـەپێناوی
ـەناوبردن و سـەرنگونکردنیاندا، بچنـە مـەیدانی جەنگەوە. بـەهۆی ئەمـەوە
ـوو کـە (ئـەم جووتیارانـە) لـە سـاڵی ١٨٤٨دا چوونـە ژێـر ئـاڵای دژە
شۆڕشەوەو پاشای هابزبورگ لەپێناوی شکست پێهێنانی شۆڕش لە ڤیێنادا
ـەکاری هێنـان. مـارکس لـەو سـەردەمەدا نووسـی کـە ((لـە ڤیێنا حەشـاماتێك
ـە ناسیونالیسـتەکان کۆبوونەتـەوە کـە بـە خـەیاڵی خۆیـان دژە شـۆڕش
ڕزگارییان بە دیاری بۆ دەهێنیٰ))(١٤).

جێگـای سەرسـوڕمان نی‌یـە کـە ((لـەو مانگانـەدا تـەواوی
یموکراسـیخوازانی ئـەوروپا لـە نەتـەوە بچووکـەکانی سـلاڤی بـێزار
وون...))(١٥).

نموونەیەکە لەم جۆرە بزووتنەوانە کە پەیوەست بوون بە راپەڕینو کۆنەپەرستانەی ئیستراتەکانەوە، کە بانگەشەیان بۆ سیستەمی پاشایەتی دەکرد لە ساڵەکانی ١٧١٤و ١٧٤٦دا لەم ڕێگایەوە خەڵکی ناوچە بەرزەکانی ئۆسکۆتلەندا دەیانویست کە خۆیان لە بەرامبەر ڕێکخستنی نوێی بورژوازیانەی کۆمەڵگادا، کە لەلایەن خەڵکی زەوی‌یە نزمەکانی ئۆسکوتلەنداو ئینگلیزەوە سەپێنرابوو، بپارێزن. نموونەیەکی‌تر بزووتنەوەی ((چووان))ی بەریتانی بوو لە دەیەکانی ١٧٩٠دا، لەم بزووتنەوەیەدا قەشەو پاشاخوازەکان بێزاری‌و هەراسانی جووتیارانیان قۆستەوە. لەبەر ئەوەی وایان دەبینی کە شێوازی باوی ژیانیان کەوتبووە ژێر مەترسی‌یەوە،و سوودیان لەم هەستەی جووتیاران وەرگرتو هەڵگەڕانەوەیەکی کۆنەپەرستانەو دژە شۆڕشگێڕییان بەرپاکرد. سێهەمین بوار بزووتنەوە کار لیستی‌یەکانی باکووری ئیسپانیا بوو کە لە ساڵەکانی دەیەی ١٨٣٠و لە ساڵی ١٨٧٢دا بەرپایان کرد. لەم بزووتنەوانەدا جووتیارانی باسك و ناوارسە تووڕەیی خۆیان لەپێناوی لەدەست نەدانی مافە باوەکانیان یاخود مافە دێرینەکانیان، بە شەڕکردن لەژێر رابەرایەتی کۆنەپەرستترین هێزدا، ئاشکرا کرد (یەکەمین داواکارییان سەرلەنوێ دانانەوەی دادگاکانی پشکنینی بیروباوەڕ بوو).
لەسەر هەمان ڕیتم، گەرچی بە قورسایی‌و لە جێگاو شوێنێکی کەمێك جیاوازترەوە، سیستەمی ئەورانژ لە ئێرلەندەدا بوو- کە بە شێوەیەکی هۆشیارانەو بە بەرنامە لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە لەژێر دروشمی باشتربوونی پرۆتستانیزم و بە مەبەستی پارچەپارچەکردنی بزووتنەوەی نەتەوەیی ئێرلەندالە کۆتایی‌یەکانی دەیەی ١٧٩٠دا پێکهێنراو وە لە ساڵەکانی ١٨٣٢-١٨٤٨-١٨٨٢-١٩١٢-١٩٢٠-١٩٢١دا سەرلەنوێ زیندووکرایەوە. ئەم بزووتنەوانە خۆیان بە ناسیونالیست دانەدەنا، ئەگەرچی هەندێك لە ناسیونالیستە هاوچەرخەکان ئەو بزووتنەوانەیان بە وێنەیەکی سەرەتایی‌یانەی ناسیونالیزم ناو دەبرد، بەڵام بزووتنەوی

له دنیایەکدا کە بە شێوەیەکی زۆر و بەرفراوان بورژوازی بڵاو دەبۆوەوە، خودی ئەوەی ((نەتەوەگەرایی)) گۆڕا بە سمبولێکی تا ڕادەیەکی زۆر پەسەندکراو و ڕەوایی پێ بەخشرا، نەتەنها ئەو بزووتنەوانەی کە دژی سیستەمی کۆنی بەسەرچوو دەجەنگن، بەڵکو ئەوانەش کە لەپێناوی پاراستنیدا هەوڵیان دەدا، لەسەر ئاڵاکانیان دروشمە ((نەتەوەیی))یەکانیان بەرزکردەوە. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لەسەر ئەم ڕێچکەیە تەنانەت ئیمپراتۆریەتە شانشینەکانیش، کە پێشتر لە ڕیزی سەرسەخترین نەیارەکانی بزووتنەوەی نەتەوەییدا بوون، خۆیان بە ناوە نەتەوەییەکان پێناسە دەکرد. پاشای هابزبورگ قەڵەمڕەوی خۆی کرد بە دوو بەشەوە لە بەشێکیاندا زمانی چیکی و لە بەشەکەیتریشیاندا زمانی ئەڵمانی لەجێگای زمانی لاتینی، بە زمانی ڕەسمی دانران.

((تزاری سەراسەری ڕووسیا))- کە لە نێو دەست و پێوەندەکانیدا بە زمانی فەڕەنسی قسەیان دەکرد، بە ڕادەیەکی بەرچاو پشتیان بە بەرپێوەبەرە ئەڵمانی زمانەکان بەستبوو- بۆ یەکەمین جار هاندان و پشتگیریکردنی ناسیونالیزمی ڕووسیای گەورەی خستە بەرنامەی کاری خۆیەوە، ناسیونالیستێك کە گروپە نەتەوەییەکانیتری بە کەم دادەنا- بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ((تا سەردەمی ئەلکساندەری سێهەم (١٨٨١-١٨٩٤) بە ڕووسی کردن نەبووە سیاسەتی ڕەسمی دەوڵەت (١٦).

سیستەمە ڕەهاکانی پادشایەتی کە لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا بە سوود وەرگرتن لە دانیشتوانی شارەکان لە پێناوی پێکهێنانی هاوسەنگی هێزدا لە بەرامبەر لۆردە فیئۆدالەکاندا، دروست ببوون بۆ جارێکیتر لە هەوڵداندا بوون کە ژیانی خۆیان، سەرلەنوێ بە سازش کردن لە چوارچێوەی هەل و مەرجی پێکەوە ژیان لەگەڵ هەندێك بەشی بورژوازیو وردە بورژوازیدا، درێژە پێبدەن. نێوەندەکانی پادشایەتی لەگەڵ بازرگانان، بانکداران، خاوەنی مانیفاکتۆرەکان، خانەدان و ڕۆشنبیرانی خاوەن بڕوانامە کە بە یەك زمان قسەیان دەکرد، لە حاڵەتێکدا

کە لەگەڵ یان دژی دوژمنەکانی - لەوانە چەند بەشێك لە بورژوازیو وردەبورژوازی کە بە چەند زمانێکی جیاواز قسەیان دەکرد- یەکیان دەگرت، ئیمتیازاتێکی دەدا.

تەنها سیستەمە ڕەهاکانی پادشایەتی کۆن نەبوون کە سیاسەتی بەهێزکردنی ناسیونالیزمێك و سەرکوتی ناسیونالیزمێکی تریان کردبووە پیشەی خۆیان؛ دەوڵەتە سەرمایەدارییەکانیش کە تەواوی ئەفریقیاو زۆربەی ناوچەکانی ئاسیایان لەنێوان خۆیاندا دابەش کردبوو، سیاسەتێکی لەو چەشنەیان کردبووە پیشەی خۆیان. نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە گەواهی ستایشکردنێکی تازەی ناسیونالیزمی ((بەریتانی))بوو، کە بۆ یەکەمین جار دەزگای پەروەردەیی سەر بە دەوڵەت دامەزران کە مندالأنیان بە گیانی شانازییە مێژووییە((نەتەوەیی))یەکانی، ڕۆمانەکان، تەتەرەکان، شیعرو گۆرانییە جەماوەرییە ناسیونالیستییەکان گۆش دەکرد؛ ئەم دەقانە کەسانێك نووسیبویان کە پەیوەندییان بەخشی بوو بە پادشایەتی، کە بە شێوەیەکی هۆشیارانە هەوڵی پێکهێنانی ئەو نەریتەیانەیان دەدا کە ئامانجیان فۆرمۆڵەکردنی هەمان خۆش باوەڕییەکانی خەڵك بوو بەرامبەر بە سیستەمی پاشایەتی. سەبارەت بە چینە ناوەندییەکان، هاوناسنامەیی لەگەڵ ((نەتەوەیی))و ئیمپراتۆریەتدا، بە تەواوەتی کارێکی ئایدۆلۆژی نەبوو بەڵکو بەرژەوەندی ئاشکرای مادی لە پشتەوەیە: بیرۆکراتیەت کە بەڕێوەبەرانی ئەم ئیمپراتۆریەتەی لە ئەستۆ گرتبوو ئینگلیسی زمان بوو، وە دەروازەکانی نێو جیهانی کارو پیشەکان، بە ڕووی ئینگلیزی و ئۆسکۆتلەندییەکاندا کرابۆوە، ئەم دەروازەیە بۆ کاثولیکە ئێرلەندییەکان و ئوسترالیەکان بەو ئەندازەیە ئاوالە نەبوو، هندییەکان و ئەفریقیەکان تەنانەت زۆر لەمانیش کەمتر دەرفەتیان بۆ ڕەخسابوو.

سوود وەرگرتن لە ناسیونالیزمی کۆنەپەرست، بە قۆزتنەوەیەکی بە بەرنامەی جیاوازییە زمانیو، ئایینییەکان بە مەبەستی لاوازکردنی

هەروەکو چۆن ئۆزانژەکان کەباس لە بالاتربوونی داخوازییەکانی پرۆتستانەکانی ئیرلەندابیەکان دەکات قۆزرابۆوە، بەریتانیا لە سەرەتای دەیەی ۱۹۹۰دا تێدەکۆشا تا لە هیندستان دیسان، یاری بە کارتی موسوڵمان دژ بە بزووتنەوەی نەتەوەیی تازەڕابوو بکات، وە لە ئاینیش بە مەبەستی دروست کردنی ناکۆکی لەنێوان بنگالەکاندا سوود وەرگرێ. هەروەها لە فەلەستینیش بەریتانیا بە هاندانی کۆچی جولەکە ئەوروپاییەکان لە کۆتاییەکانی جەنگی جیهانی یەکەمدا، هەوڵیدەدا تا هێزی بەرگری عەرەبەکان لە بەرامبەر دەسەلاتدارێتی بەرتانیادا لاواز بکات. بەریتانیا هێزی پۆلیسی قوبروسی بەزۆری بە بەکارهێنانی کەمە نەتەوەیی تورك زمانی دوورگەکە بەهێز دەکرد. وە لە سیلان (سیریلانکای ئەمڕۆ) دیسان بەشێك لە تامیلی زمانەکانی لە دروست کردنی هێزی پۆلیسدا بەکار هێنا.

## ناسیونالیستەکان و کامیونالیستە ناکۆکەکان

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا، لە سەرتاسەری جیهاندا، چەرخێکی نوێ سەبارەت بە بلاوبوونەوەی ئایدیالی نەتەوەیی دەستی پێ کرد. نەتەوە ناکۆکەکان بە خێرایی چوونە ناو گێژاوی جەنگ و پێکدادانە خوێناوییەکانەوە لە پێناوی زەوییەکی هاوبەشدا کە هەموویان پێشتر لە سەری ژیابوون.

لە مۆدیلی ناسیونالیستە یەکەمینەکاندا،مەرج ئەوە بوو کە بەئاسانی دەیتوانی کەمە نەتەوەکان بەرەو ناو چوار چێوەی دەوڵەتە نەتەوەیی یەکان ڕاکێشێ. هەڵبەتە سەبارەت بە زۆرێك لەیەکەمین دەوڵەتە نەتەوەییەکان، ئەم مەسەلەیە ڕاستییەکی تێدایە. ئینگلیسییەکان توانییان لە دروست کردنی ناسنامەو هەستێکی نەتەوەیی هاوبەشدا لە چوار چێوەی((بەریتانیا)) و ئیمپراتۆریەتی بەریتانیادا، سەرکەوتن بەدەست بهێنن، فەرەنسییەکان

توانییان ئەو باشوریانەی کە بەدیالێکتی ئەکسیتانی قسەیان دەکرد، بەلای خۆیاندا ڕاکێشن، لەتانەت پشگیری و هاوسۆزی زۆرێک لە ئەڵمانی زمانەکانی ئەلزاریش بەلای خۆیدا ڕاکێشن، ئیمپراتۆریەتی ئەڵمان پشتگیری و هاو سۆزی ساکسۆنیەکان، تورینگینا، هانوفەر، هەمبورگ و بارمن بەدەست بێنێ(هەرچەند ڕەوتی سەربەخۆیی خوازەکان لە باڤاریا و رایلند هەر وەکو پێشووتر درێژەیان بەژیانی خۆیاندا).

بەلام ئەو ناسیونالیستانەی کە پاشتر تەکامولیان کرد، دوو چاری کێشەو گرفتێک، زۆر جیاواز ئەبوون هەر بەو جۆرەی پێشتر باسمان کردبوو، دواکەوتنی پەیدا بوونی سەرمایەداری، بەومانایە بوو کە لە نێو ئەو خەڵکانەی کە دەبوو. نەتەوەیەکی نوێ پێکبهێنن، بەدەگمەن زمان و وتەیان دیالێکتێکی بەربلاوپەیدا دەبوو لەوانەبوو ناسیونالیستەکان بەراگەیاندنی زمانێکی ڕەسمی، وەك زمانی نەتەوەیی نوێ، پشتگیری بە شێك لە خەڵك دابین بکەن، بەلام ئەم هەنگاوە لەهەمان کاتیشدا بەمانای دژایەتی کردنی گرووپە نەتەوەییەکانی‌تر بوو.

هەتا ئەوکاتەش کەسەرمایەداری بەرێژەیەکی دیاری کراو تەکامولی کرد، مەسەلەکان هەمیشە هەروا ئاسان نەبوو. بۆ چی ناکە تەکامولی سەرمایەداری بەشێك لە جووتیاران، کەتوانایان بەسەر زمانی نەتەوەیی دا نەدەشکا، بەبردنە نێو پەیوەندییەکانی بازارەوە کەلە نێویاندا توێژێکی تازەی وردەبورژوازی پەیدا بوو. بەلام بەشێك لەڕۆشنبیرە تازە پەیدا بووەکان لەم ژینگە کۆمەلایەتیەوە هەولیاندەدا تاشێوە زمانەکانی جووتیان بخەنە نێو زمانە نوێکەوەو بەم شێوەیە تێدەکوشان تابەمەبەستی دا بین کردنی شوێنێکی ڕەسمی بۆ ئەوان و وەلەدواجاردا لە پێناوی پێکهێنانی دەولەتی نەتەوەیی پشت بە ستوو بەواندا، خەباتیان دەکرد. لەم ڕووەوەبوو کە وەك نموونە ڕووداوی کۆچی بەردەوامی جووتیاران، شاری پراگی لەشارێکەوە کە بەزۆری ئەڵمانی زمان بوون گۆڕی بەشارێکی بەزۆریی چیك زمان، وە سەرئەنجام ئەم مەسەلەیە داخوازی دەولەتێکی

لە هەرێمەکانی ئەمسای بوهیمی و مورافیادا واقعی کردەوە. بەڵام لاتی کەم لەکۆتایی یی‌کانی سەدەی نۆزدەدا زۆرینەیەکی لە بەر چاوی چیک زمان لە شەڕی پراگدا پەیدا ببوون.

لە زۆرێک لە شارە گەورەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات، بالکان، قەفقازدا، سەرجەمی گر وپەزمانیە نەیارەکان، بەبێ ئەوەی بەناچاری یەکێک لەم زمانانە باڵا دەست بن، گەشەیان کردبوو. هەنگاری و ڕۆمانی زمانەکان لە ترانسیلڤانیا،ئیتالی و ئسلوون زمانەکان لە تریەدا، ئەڵمانی و پۆڵۆنی زمانەکان لە سیلسیا، لیتوانی، پۆڵەندی، یەدیش زمانەکان لە ڤیلنیوس، ئۆکرانی، یەدیش و پۆڵۆنی زمانەکان لەئۆکرانیای خۆرئاوادا، تورک، یۆنانی، ئەرمەنی زمانەکان لە ئەستەمبوڵدا، یۆنانی وسلاڤی زمانەکان لە مەقدۆنیادا، ڕووس، ئەرمەنی و تورک زمانەکان لە باکۆدا.

جیهانی سەرمایەداری جیهانێک بوو کە لە دەوڵەتانی نەتەوەیی زمان پێکهاتبوو، بەهاتنە ناوەوەی هەرگروپێکی نەتەوەیی بۆ نێو ئەم دنیایە، ووردەبەرژوازی ئەو نەتەوەیە، داوای زمانی دایکی ودەوڵەتی خۆیی دەکرد. بەڵام ئەم وورده بورژوازی‌یە زۆر درەنگتر پی‌ی نابووە سەر زەوی کەبتوانێت لەمیانەی پرۆسەێکی درێژخایەن و خۆبەخۆییدا، هەر وەکو ئینگلستان، هۆڵەندی یەکان، یان فەرەنسی و ئەڵمانی یەکان، دەستی بەزمانێکی یەککرتوودا بگات. ناسیونالیستە جیاوازەکان تەنها لەڕێگای جەنگە خوێناوی‌یەکانەوە دەتوانن لەگەڵ یەکتردا- لەهەندێک بواردا لەبری جەنگ بەهۆی حکومەتە کۆنە ڕەهاکانەوە- وەیان جەنگ لەگەڵ ئەواندا بەئامانجەکانی خۆیان بگەن.

واتا کرداری یەکانی ئەم مەسەلەیە خۆی لەکارەساتەکانی جەنگی دووەمی بالکاندا لە ساڵی ١٩١٣ دا نیشان دەدات، لەم جەنگەدا دەوڵەتە نەتەوەیی‌یە ناکۆکەکانی ڕۆمانیا، سربستان ویۆنان بەیەکەوە لەدژی بولگارستان یەکیان گرت، مەقدونیایان دابەش کرد بەسەر دوو پارچەدا، بەرهەمی ئەم جەنگە نیو ملیون کوژراو بوو.

لەساڵی ١٩١٥ دا ئەم هەل ومەرجە نموونە پراکتیکی یەکانی خۆی لەجێگایەکی تریشدا نیشان دا. لەم ساڵەدا ئەفسەرە ناسیونالیستەکانی ((تورکە لاوەکان)) هەوڵیاندا تا خەڵکانی کورد وتورکی ئیمپراتۆریەتی کۆنی عوسمانی بەدوای خۆیاندا ڕاکێشکەن وناباوودی وکوشتاری زۆربەی هەرمەنۆری خەڵکی ئەرمەنی زمانی ئیمپراتۆریەتەکە ڕێکبخەن. نموونەیەکی تری لەم جۆرە لەساڵەکانی (١٩١٨ _ ١٩١٩ ) دا گروپە ناسیونالیستە نەیارە ئەرمەنی و ئازەری یەکان دەستیان بەکوشتاری یەکتر کرد لەباکۆدا. وەسەرەنجام، لەشەڕی ساڵەکانی(١٩٢١ _ ١٩٢٢ )ی نێوان تورکیاو یۆناندا، سوپاکانی ئەم دوو وڵاتە سەدەها هەزار کەسیان لە خەڵکی نا چەکداری سەر بە نەتەوەکەی تریان لە وڵاتەکەی خۆیاندا دەرکرد. لەئەورووپای ڕۆژهەڵات، باڵکان،قەفقازادا ناسیونالیزم چووە قۆناغێکەوە کە ئیتر دەبێت نەتەوە کوژی، بەزۆر دەرکردن و تەنانەت پێکهێنانی ئۆردوگاکان بەمەبەستی جینۆسایدکردن، وەك ((پاکسازی نەتەوەیی)) بناسرێت.

# مارکسیزمی کلاسیك و مەسەلەی نەتەوەیی

مارکس و ئەنگلس بەشێك بوون لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی دەیەی ١٨٤٠. ژیانی سیاسی خۆیان لەسەر بوونیادی لیبرالیزمێکی دیموکراسیانەی ڕادیکاڵدا دەست پێکرد،بەڵام زۆر زووتێگەیشتن کە ڕزگاری یەکجاری مرۆڤایەتی لە ڕێگای بزووتنەوەیەکەوە ئەگەری سەرکەوتنی مسۆگەرە کە زۆر لەوەزیاتر واوەتر بڕوات،چاوییان بڕییە شۆڕشی چینی کرێکار شۆڕشێك کەکۆتایی بە((جیاوازی یە نەتەوەیی و ناکۆکی یەکانی نێوان خەڵك)) دینیٰ. بەهەمان ڕادەی کە کۆتایی بە چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە دەهێنێ، بەوڕادەیەش کۆتایی بە چەوساندنەوەی نەتەوەیەك لەلایەن نەتەوەیەکی ترەوە دەهێنێ. وە بەهەمان ئاست کە دژایەتی و ململانێ ی چینایەتی نێو نەتەوەیەك کۆتایی پێدەهێنێ، دوژمنایەتی نەتەوەیەك لە دژی نەتەوەیەکی تر بە ئاستی کۆتایی دەگەیەنێ(١٧).

بەڵام ئەم مەسەلەیە، بەو مانایە نەبوو کە ئەوان خۆیان لە خەباتی بورژوا دیموکراتیك دژ بە حکومەتە ڕەهاکان بەدوور دەگرن. ئەوان خۆیان خستە نێو دڵی ڕاپەڕینە شۆڕشگێڕیەکانی ساڵەکانی (١٨٤٨ -١٨٤٩) وەو لەتێڕوانینی چەپەوە هەوڵەکانی بوژوا دیموکراتیکەکان لەساز شیاندا لەگەڵ ڕژێمی کۆندا خستە ژێر نووکی تیژی ڕەخنەوە . ڕۆڵێکی چارە نووسسازی کلیل ئاسایان سەبارەت بە چوار بزووتنەوەی نەتەوەیی لەم شۆڕشانەدا گرتە ئەستۆی خۆیان : خەبات کردن لە پێناوی یەکخستنی تەواوی ئەڵمانیا و ئیتالیادا وەك دەوڵەتانێکی نەتەوەیی بورژوایی لە جێگای پاشانشینە جیاوازەکان کە ئەم دوو وولاتەیان بە سەر چەندین پارچەدا دابەش کردبوو، خەبات لە پێناوی ڕزگار کردنی هەنگاریا لەدەسەڵاتی زنجیرە پاشاکانی هابزبورگ کە لە ڤیێنادا نیشتە جیٰ بوون، وە خەبات کردن لە پێناوی ڕزگار کردنی پۆڵەندا لەدەستی تزاریزمی

ڕووسیادا، واتە لەدەستی پارێزەری کۆنەپەرستی لەتەواوی ئەورووپادا.
هەرسەرکەوتنێکی هەربەشێك لەم بزووتنەوانە بەلەبەر چاوگرتنی هەل و مەرجی زاڵ لە ساڵەکانی(١٨٤٨ -١٨٤٩ )دا بەدەستکەوتێك بۆ تەواوی شۆڕش دەژمێررا، وەشکستی هەر یەکێکیشیان سەرکەوتنێك بووبۆ دژە شۆڕش. بەم پێیە مارکس و ئەنگلس لە گۆشە نیگای پێکهێنانی دەوڵەتە نەتەوەییە تازەکانەوە لە ئەڵمانیا،هەنگاریا، ئیتالیا وپۆڵەندادا، وەك وەشاندنی گورزی کۆتایی لەپاشماوەکانی فئۆدالیزم لە ئەورووپادا سەیری شەڕە شۆڕشگێڕی‌یەکانیان دەکرد لەنێو ئەو دوژمنانەدا کە دەبوو لەم جەنگەدا لەگەڵیاندا حسابخوازی (تصفیە حساب) بکرێ، سیاسەتمەدارانی سلاڤی هەبوو لە ئیمپراتۆریەتی نەمساو-هەنگاریادا، کەبەخواستنی هەندێك گوزارشتی ناسیونالیستی فریوکارانە پشتگیری و پشتیوانی خۆیان لە حکومەتە رەهاکان دەردەبڕێ. شکست پێهێنانی ئەوانە بەشێك بوو لە زەمینە سازکردن لە پێناوی پەرەگرتنی هەمە لایەنانەی دیموکراسی بورژوازی و وەلەم رێگەیەشەوە زەمینە خۆش کردن بوو بۆ چینی کرێکار لە دژی رژێم.

مارکس و ئەنگلس بۆ ئەوەی بزانن لەهەل و مەرجێکی وەهادا چی بکەن، پێویستیان بە شیکردنەوەیەکی ئاڵۆزو پێچیدە سەبارەت بە ناسیونالیزم نەبوو. لە هەمان کاتیشدا نابێت ئەو راستیە فەرامۆش بکەین کەتەواوی کاتەکانی خۆیان بۆ بەشداری کردنیان لە پڕوپاگەندەی شۆڕشگێڕی و بەرهەم هێنانی روانینێکی بە تەواوەتی نوێ دەربارەی مێژوو کۆمەڵگا، تەرخان کردبوو.

لەم رووەوە بە تایەتی ئەنگلس چەمکەکانی هێگلی سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو بەتاڵ کردەوەو، لە نێو بزوتنەوە نەتەوەیی‌یە جیاوازەکاندا بە پێی ئەوەی کە ئەم بزوتنەوانە " خەڵکە مێژوویی‌یەکان" بە مێژوویی درێژو بە دوادا گەڕان نوێنەرایەتی دەکەن، یان " خەڵکانی نا مێژوویی" ( کە لە پرۆسەی تەکامولی مێژووییدا بە پەراوێزنشینی مەحکومن) نوێنەرایەتی دەکەن، جیاکردەوە.

باوەڕناکەم، لەم قۆناغەدا، نە مارکس و نە ئەنگلس هیچ یەکێکیان تێگەیشتنیان سەبارەت بەوەی کە نەتەوە چ دیاردەیەکی مێژوویی نوێیە،نی یەو، وەنەشیان دەزانی ئەو بزووتنەوانانەی کە مەحکومیان کردبوون، تاکوێ لە پاییەتەمەندی یەکانی بزوتنەوە نەتەوەیی یە هاوچەرخەکان بێ بەش بوون(١٩).

ئەم دوانە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بانگەشەکانیان دژبە حوکمڕانی بەریتانیا لە ئێرلەندا سەری گرتووە، ئاراستەی کاری خۆیان سەبارەت بە بزووتنەوە نەتەوەیی یەکان لە دەی ١٨٦٠ دا گۆری پێشتر ئەوان سەرکوتی ئێرلەندی‌یەکانیان لەلایەن بەریتانیەکانەوە مەحکوم کردبوو، بەلام بۆ کۆتایی‌هێنان پێی لە چاوەڕوانی گۆڕانی شۆڕشگێڕانە بوون لە ئینگستاندا. ئێستا ئەوان تێڕوانینی خۆیان گۆڕیوە. مارکس بۆ ئەنگلسی نووسی : زۆرینەی هە وڵەکانم کەدا بووم بۆ ئەوە بوو تا نیشانی بدەم کە کرێکارانی ئینگیلیس لەلایەنگری فیسانیزم(بزووتنەوەی یەکەمی ئێرلەندیی‌دەکان-و.ف)ن....من ئەوکاتە وا بیرم دەکردەوە کە جیابوونەوەی ئێرلەندا لە ئینگلستان نامومکینە. بەلام،ئێستا وابیردەکەمەوە کە ئەم مەسەلەیە حەتمی‌یە، ئەگەر چی لەوانەیە دوای جیابوونەوە شاهیدی دروست بوونی فیدراسیونێك بین لە نێوانیاندا(٢٠). ئەو شتەی کە ئێرلەندا پێوستی پێیەتی... خود موختاری و سەربەخۆیی لە بەریتانیا... شۆڕشی زەوی ... پشتیوانی باجە گومرگی‌یەکان لەبەرامبەر ئینگلستاندایە(١٢).

مارکس بۆ کۆگلمانی نووسی: چێنی کرێکار ی ئینگلس... پێش ئەوەی تێڕوانینی خۆی بەتەواوەتی لە تێڕوانینی چینی دەسەلاتدارەکان سەبارەت بە ئێرلەندا جیانەکاتەوە، ناتوانێ هیچ کارێکی یەکلایی کەرەوە لێرە، واتە لە ئینگلستاندا، بەئەنجام بگەیەنێت. چینی کرێکاری ئینگلیس نەك تەنها دەبێت لەگەڵ چینی کرێکاری ئێرلەندادا خاوە نی مەسەلەیەکی هاوبەشبن، بەڵکو دەبێت لە هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیەك کە لە ساڵی١٨٠١ داپەیدا بووە،دەستپێشخەری بکەن.

ئەم مەسەلەیە نابێت لە گۆشەنیگای هاونەردی لەگەڵ پڕۆلیتاریای ئێرلەندەدا، کە لە داخوازی سەرچاوە گرتوو لە بەرژەوەندی یەکانی پڕۆلیتاریای ئینگلیسەوە هەڵقوڵابێ.

بەدەر لەم بۆچوونەپڕۆلیتاریای ئینگلیس بۆ هەمیشە لە زنجیری چینە دەسەلاتدارەکاندا دەمێنێتەوە، بەڵێ کە بێسوودە لەگەڵ ئەواندا لەدژی ئێرلەندا بەرەیەکی هاوبەش پێك بهێنن..(٢٢).

مارکس لە پەیوەندی خۆیدا لەگەڵ مەسەلەی ئێرلەندادا خاڵێکی زۆر گرنگ دەخاتە ڕوو: ناسیونالیزمی کرێکارانی سەربەنەتەوەی ستەمگەر، ئەوانی لەبەرامبەر حوکمڕانەکانیاندا دەستەمۆکردووە، وەتەنها خودی خۆیان زەرەرمەند دەبن، لەحاڵێکدا ناسیونالیزمی نەتەوەیەکی ژێردەستە، ئەوان بەرەو خەبات کردن لەدژی ئەو حکومڕانانە ڕادەکێشێ. لەگەڵ ئەمانەشدا، مارکس لە خەباتی نەتەوەیەك پشتیوانی دەکرد کە هیچ کاتێك نەیدەتوانی بەشێك لە لیستی((نەتەوە گەورەکانی مێژووی ئەوروپا)) پێك بهێنێ. بەهەر حاڵ. ئەوە تەنها پاش مەرگی مارکسە کە ئەنگڵس بەپشت بەستن بە شیکردنەوەیەکی نوێی بنیاتنراو لەسەر بنەمای مەتریالیزمی مێژوویی لە نەتەوەکان دەکۆڵێتەوە. تەرحێکی ناتەواو سەبارەت بەدووبارە نووسینەوەی جەنگی جووتیاران لە ئەڵمانیادا- لەبارەی ناثارامی یەکانی سەردەمی ریفرماسیونەوە- ئەوی ناچارکرد کەدەست بەتوێژینەوەی گۆڕاکاری‌یەکانی کۆمەڵگا لە کۆتایی یەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا بکات و هەندێ فاکتەری مادی سەرنجیان ڕاکێشا کە ببوونە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتە نەتەوەیی‌یەکان وەك دیاردەیەکی مێژوویی نوێ. ئەنگڵس پێ لەسەر ئەم خاڵە دادەگرێ‌کە لە هەمان کاتدا شارەکان گرنگی پەیدا دەکەن ولەگەڵ پادشایەتی‌دا دژ بە باقی چینی دەسەلاتداری فیئۆدال یەك دەگرن، ((لەنێو دڵی سەرلێشێوانی خەڵکدا کەڕوویەکی دیارو تایبەتی سەرەتاکانی سەدە کانی ناوەڕاست بوو، ووردە ووردە ناسیونالیستە نوێیەکان پێکەیشتن. بەلام ئەم ووتارە لە دەستنووسێکی هەمان کتێبێکی ناوبراو دا بوو کە تا ساڵی ١٩٣٥ بلاو نەکرابۆوە(٢٣).

شـیکردنەوەی ماتریالیسـتی مێژوویـی قووڵـتر لەسـەر ناسـیونالیزم، تاکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەرهەم نەهات، واتا تا ئەو کاتەی کە گۆڕانکاری سیاسی لە ناکاو خێرایی وەها شیکردنەوەیەکی خستە بەرنامەی کارەوە.

گەشـەکردنی بزووتنـەوەی سۆسیالیسـتی لـە ئیمپراتۆریـەتی ئـەڵمانیادا ،بەخێرایی بـووە هـۆی گەشـەکردنی هـەمان بزووتنـەوە لەنەمساشدا. لـەو سەردەمەدا نەمسا کە بوهیمیا و مۆراڤیاشی دەگرتەوە کە لە ئێستادا بـە شێك لە چیکۆسلۆڤاکیا پێك دەهێنن، بوو. وەزۆرێك لەمارکسیستە ئەڵمانی زمانەکان لە م ناوچەیەوە سەریان هەڵداوە: ئۆتۆ باور و رودلف هیلفردینگ نەمساوی بوون، کارڵ کاوتسکی چیکـی بـوو. بـەڵام رێـك لـە کـاتێکدا کـە حیزبی﴿سۆشیالیستی﴾ی نەمسا لە یەکەمین سەرکەتنی راستەقینەی خۆی لە دەیەی ۱۸۹۰ دا شادمان ببوو، روو بە ڕووی دایە لۆکێکی توونـدو رەق ببـۆوە بـەهۆی پەرۆپاگـەندە(تـەبلیفاتی)ی ناسیونالیسـتی یـەوە لـە نێـوان سـلاڤیەکانی نەمسـادا، ئۆتـۆ بـاوەر هـەوڵیدا تـا بـە پێشکەشـکردنی شیکردنەوەیەکی نویٚ لـە سەر ناسیۆنالیزم، دایەلۆگەکە بەلایـەکدا بخـات. ئـەو بەڵگـەی دەهێنایـەوە کـە نەتـەوە( کۆبوونەوەیـەکی کلتـوری) یـان ( کۆبوونەوەیەکی هاوچارەنووسان) یە، کە تەواوی ئەو کەسانەی کە سـەر بە وون بە ئـەزموون گـەلێکی جیـاواز لـە ئەزموونـەکانی خـەڵکانێکی سـەر بـە نەتەوەیەکیتر ئاشنا دەکات (۱۲).

نەتـەوە تایبەتمـەندی هاوبـەش بە تـەواوی ئەندامای خۆی دەبەخشـێت، بەشێوەیەك بۆ نموونە کە ئەگەر ئینگلیسی و ئەڵمانییەك، پێکەوە سەفەر بکەن، ئەزموون گەلێکی جیاواز لەو گەشتە هاوبەشە بە دەست دەهێنن، ئەم هەمەڕەنگییە فەرهەنگییە وا دەکات، کە تەنانەت ئەگەر خەڵك بە زمانێکی هاوبەشـیش قسـەبکەن، وەك دانیمارکییـەکان و نەرویژییـەکان یـان سـربەکان و کرواتـەکان، ئـەوا هـەروەکو پێشـتر بـە نەتـەوە گـەلێکی جیـاواز دەهێننـەوە (۲۵). ((لـە راسـتیدا ئـەم هەمـەڕەنگی فەرهەنگییـە

نەتەوەکان،سەرەڕای ئاوێتە بوونی خوێنی، لێبڕاوانە لە یەکتر جیادەکاتەوە))(٢٦).

باوەر بەڵگەی دەهێنایەوە کە فەرهەنگی نەتەوەیی بەسێ قۆناغی مێژوویدا تێپەڕییووە. ئەم کلتورە لەگەڵ کۆمۆنیزمی سەرەتاییدا دەست پێ دەکات، کە لەم قۆناغەدا(تەواوی هاونیشتمانیان خزمی یەکترن، چ وەك لایەنی کۆمەڵایەتی کە هاوخوێنی یەکترن، وەیان چ بە هۆی کلتوری هاوبەشەوە)، پاشان کۆمەڵگای چینایەتی سەر هەڵدەدا کە لەوێدا کلتوری نەتەوەیی، یەك پارچەیی خۆی لە کلتوری چینی دەسەڵاتدارەوە وەردەگرێ، وە سەرەنجام کلتوری نەتەوەیی (نوێنەرایەتی کۆمەڵگای سوشیالیستی ئایندە دەکات)(٢٧). بەلام (نەتەوە) دەتوانێ لە پەیوەند بە گەشەکردنی هێزەکانی بەرهەم هێناندا ، وەك پێکهێنەری(ئەوەی کە لە ئێمەدا مێژوویی یە) (٢٨)، وەك (عصارەیەکی مێژوویی)ببێتەجێی قسە وباس.

ئەو لە درێژەی باسەکەیدا، بە دەستەواژەی زۆر ئاشکرا کەسانێك کە بەهای نەتەوە لە بەر چاو ناگرن و لە شوێنی ئەوە (جیهانی نیشتمانی پرۆلیتاریا)، ( سەرەتاییترین هەڵویستگیری چینی کرێکار لە بەرامبەر کێشمە کێشەکانی دنیای بورژوازی) یاندا هەڵبژاردووە، دەداتە بەر شالاوی رەخنە و گوتی ئەوانە لە (هاوڕێیانی چیك زمان و ئەڵمانی زمان)ن قسەدەکەن، لە جێگایی ئەوەی بڵێت (هاوڕێیانی چیك و ئەڵمانی)ن. ئاشکرای کرد کە ئەوانە بە دەست بیرۆکەی(تقلیل گرایانە رۆشنگرانە) و (یەك تێگەیشتنی (اتمی) و تاکگەرایانە سەبارەت بە کۆمەڵگا) گیرۆدە بوون، ئەمەیە کە ناتوانن تێبگەن کە (تاکی مرۆڤ، خۆی بەرهەمی نەتەوەیە).

ئەنجامگیری باوەر وەهابوو کە دەبێت سۆسیالیستەکان چەمکی نەتەوە، وەك فاکتەرێکی گرنگی کۆمەڵایەتی مێژوویی لە بوونی مرۆڤدا، بەگەشبینی و دڵنیایی یەوە، بەنەتەوە جیاوازەکان بگوترێت کە تەنها لە ژێر ئالای سۆسیالیزمدا، کلتوری نەتەوەیی بەدوایلەی تەکامولی خۆی دەگات. ((سۆسیالیزم ئارەزووەکانی تەواوی نەتەوەکان لە یەکێتی سیاسی و

ئازادییاندا رادەگەیەنێ. سۆسیالیزم سەبارەت بە نەتەوەی ئەڵمانیش هەمان خواستی هەبوو))(٣٠). ئەو پاساوی دەهێنایەوە کە وەها پشتیوانییەک لە ناسیونالیزمی کلتوری،ئەو دەرفەتە بۆ سۆسیالیستەکان دەڕەخسێنێ کە لە پارچە پارچە کردنی دەوڵەتە گەورەکان، کە لە دیدی ئەوەوە لە پێناوی فر اوان بوونی ئابووری دا پێویست بوو پێشگیری دەکات.

سۆسیالیستەکانی نەمسا بەرنامەیەکی مورەتەبیان دانا کە بە شێکی لە سەر بنچینە ی بۆ چوونەکانی باوەر داڕێژرا بوو(٣١) لەم بەرنامەیەدا بەڵێن بە تەواوی ئەو نەتەوە جیاوازانەی کە لەنێو سنووری ئیمپراتۆریەتی نەمسا- هەنگاریادا دەژیان، درا بوو، کەهەموویان دەتوانن لە چوار چێوەی نەخشەی سیاسی ئیمپراتۆریەتی نەمسا - هەنگاری‌دا دامەزراوە و دام و دەزگا نەتەوەیی‌یەکانی خۆیان بنیات بنێن. بەهەموو گروپێکی نەتەوەیی لە هەر ناوچەیەکی دیاری کراودا، لە بواری مەسەلە فەرهەنگی و پەروەردەیی‌یەکاندا ئۆتۆنۆمی دەدرێت، پاشان ئەم گروپە لەگەڵ گروپەکانی ناوچەکانی تردا دەچنە نێو چوار چێوەیەکی فیدراڵی‌یەوە، کە سەرنجام هەموویان بەیەکەوە دامەزراوەیەکی یەکگرتووی ئۆتۆنۆمی لەسەرانسەری ئیمپراتۆریەتەکدا، دادەمەزرێنن. هیچ زمانێک وەک زمانی رەسمی دانییێدا نانرێ، ئەگەر چی(ئەگەر هەبوونی زمانێکی هاوبەش پێوست بێت، پەرلەمانی فیدراڵی دەتوانێت لەوبارەیەوە بڕیاربدات). پێکهاتەیەکی لەم چەشنە لەو گۆشە نیگایەوە کێشرا بوو کە(تایبەتمەندی‌یەکانی تەواوی خەڵکی نەمسا زیاتر زەق دەکاتەوە و درزەکانی نێوانیشیان گەورەوتر دەکات)(٣٢).

ئەنجامی پراکتیکیانەی تەرحێکی لەم چەشنە هاندانی ئەندامانی بزووتنەوەی سۆسیالستی بوو، بەدانی ئیمتیازی بەردەوام بەکەسانێک بوو کە لە سەر جیاوازی‌یە رۆشنبیری یەکانی نێو چینی کرێکار پێ دادەگرن، تا ئەو رادەیەی کە یەکەمین حیزبی سۆسیالیست و پاشانیش یەکێتی یە کرێکاری‌یەکان دابەش بوون بۆ چەندەها رێکخراوی جیا جیا- مەسەلەیەک

که دەبێتەهۆی دڵخۆشی خاوەنکارانی ئەڵمانی زمان و چیکی زمان، کەمێزی کار لەلایەنی تێکەڵاوی زمانی‌یەوە دەچەوسێننەوە.

یەکەمین شالاوی کۆبەندی تیوری دژ بە بۆچوونەکانی باوور کارل کاوتسکی دەستی پێکرد. ئەو لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٨٨٠دا بە قوڵی شیکردنەوەی ماتریالیستی خۆی سەبارەت بەسەرچاوەی پەیدابوونی نەتەوە مۆدێرنەکان دەست پێکردبوو، وە سەرقاڵی نووسینی چەندەها ووتار بوو کە تایبەت بوو بەلایەنە جۆراو جۆرەکانی هەمان مەسەلە. ئەم بەرهەمانە خاڵی بە هێزکردنی تێڕوانینەکانی چەندەها مارکسسیتی وەك لینین بوو.هەر بەوجۆرەی کە( گورگ هاوپشت) دەست نیشانی کردووە(کاوتسکی کە تیوری‌یەکانی خۆی فۆرموڵە کردووە، بەبێ ئەوەی سیستەمێکی دیاریکراویان پێببە خشێت روونکردنەوەکانی خۆی لە شێوەی بانگەوازی جیاوازدا دەربڕیوە، ئەم دەقانە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ سەرچاوەیەکی موعتەبەری ئەم مەسەلەیە بوو) (٣٣). جیاوازی کاوتسکی لەگەڵ باووردا(روو بە ڕووبوونەوەی نێوان دوو تێگەیشتنی جیاواز بوو سەبارەت بە نەتەوە)،کە لینین بە( کلتوری- سایکۆلۆژی) و(مێژوویی- ئابووری)ناوی دەبرد(٣٤).

کاوتسکی ناشیاوی بوونی پراتیکیانەی پێناسە کردنی نەتەوە بە رەسمی دەناسێ:(نەتەوەیەك شکڵبەندی کۆمەڵایەتی یە کە ئەستەمە بتوانرێ پەی بەهەموو لایەنەکانی ببرێ، شکڵبەندی‌یەکە کە هەرگیز ناتوانرێ یاساکانی خۆی بە ئۆرگانیزمێکی کۆمەڵایەتی خاوەن پێناسەی دیاریکراو بگۆرێت. نەتەوەپەیوەندی‌یەکی کۆمەڵایەتی‌یە کە بە بێ ووچان خۆی دەگۆڕێ، کەلە هەل و مەرجی جیاواز دا بایەخ و گرنگی جیاوازی هەیە.....)(٣٥).

بەلام کاوتسکی کەم و زۆر، دووپاتی دەکردەوە کە دەتوانێ لە پەیوەند لەگەڵ گۆڕانکاری یە ئابووری‌یەکاندا دەرکی نەتەوە بکات.(چەقبەستن و جیابوونەوەی کۆمەڵگاکان لە شێوەی دەوڵەتە نەتەوەیی‌یەکاندا یەکێك

لـە بـە هـێزترین هەرەمـەکانی گۆڕانـی ئابووری‌یـە)(٣٦). ئـەو بەڵگـەی دەهێنایـەوە کـە خـودی ئـەم مەسـەلەیە بـە تەنـهایی روونـی دەکاتـەوە کە بۆچی، بـۆ نموونـە: ئـەڵمانی زمانـەکانی بۆهیمیـای بـاکوور خۆیـان بـە بەشـێك لـە نەتـەوەی ئـەڵمان دادەنێـن، لـەکاتێکدا ئـەڵمانی زمانـەکانی سویسرا هەستێکی لەو چەشنەیان نی‌یە(٣٧).

((شێوازی کلاسیکیانەی دەوڵەتی مۆدێرن)) بەهۆی رۆڵـی لـە تـەکامولی ئابووری دا، (دەوڵەتی نەتەوەیی‌یە، بەڵام شێوازە مۆدیرنەکان بە شێوەیەکی گشتی، تەنها یەك مەیلن، بە دەگمەن رێکدەکەوێ کە شێوازە کلاسیکیەکان بە شێوەیەکی بە تەواوەتی خەسلەت نماگەشە بکەن ) (٣٨).

ئەو لـە سـەری دەڕوا کـە (بەهـەمان رادە کـە ناکۆکی‌یـە ئابووری‌یـەکان قووڵ ببنـەوە، هـەر ناوچەیـەکی ئابووریش تێدەکۆشێ‌کە بەرهەمە شاری و گوندی‌یەکانی خۆی بـەر بـڵاو بکـات. بـەڵام بـە شـێوەیەکی زۆر بـەرفراوان ناتوانێت ئەم کارە بباتـە پێشـەوە، بـەبێ ئـەوەی زیـانێك بـە دراوسـێکانی خۆی نەگەیەنێ.ناوچە جیاوازەکانی ئەمسا مـەیلی جیابوونـەوەیان هەیە، و ئەمـــەش مەســـەلەی رێککـــەوتن و ئاشـــتی نێـــوان نەتـــەوەکان سەخت تر دەکات)(٣٩).

کاوتسـکی رەخنـە لـەباوەر دەگـرێ لـە بـەر ئـەوەی رۆڵـی زمــان بەکـەم دەگـرێ، ئـەو دەڵـێ تەنـها بەیـەك نموونـە ئاشـناین کـە نەتەوەیـەك لـە یـەك زمـان زیـاتر پێکـهاتبێ(کۆبوونـەوەی زمانـەکان) کەهـەر هـەمان سویسـرایە. سـەبارەت بـە نەتـەوە جیاوازەکـان کـە یـەك زمـان بـە کـار دەهێنـن-لـەم بـوارەدا نـاوی ئینگلیسـی‌یەکان و ئێرلەندی‌یـەکان، دانیمارکی‌یەکان و نەرویژی‌یەکان، سربەکان و کرواتەکان دەهێنێ-دەڵێت: ئـەم مەسـەلەیە ناسـەلمێنێ کـە هەریەکەیـەکی نەتـەوەیی لـە هـەمان کـاتدا یەکە یەکی زمانیشە، بەڵکو زۆر بـە سـادەیی ئـەو راستی‌یە دەسـەلمێنێ، کـە لەهـەندێك کاتـەکاندا، یەکـە یـەکی زمـانی دەتوانـێ‌لەوو نەتـەوە لـە خۆبگـرێ، و هـەروەها دەیسـەلمێنێ کـە گردبوونەوەیـەکی زمـانی تەنـها

نیشانەی تایبەتمەندی نەتەوەیەك نی‌یە )(٤٠). لەراستی‌دا (رۆڵی کاریگەری زمان لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا ئێمە بە تێگەیشتنی بەشێکی گرنگ لە هێزی هەست و سۆزی نەتەوەیی ئاشنا دەکات)(٤١).

کاوتسکی تا ئەو ئاستە پێشڕەوی کرد کە پێکهاتنی دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ گەلێك فاکتەر بگێڕێتەوە. یەکەمین فاکتەر پێویستی بورژوازی بوو بە مەبەستی دابین کردنی بازاڕێك بۆ ساغ کردنەوەی شمەکەکانی خۆی، کە نەکەوێتە نێو کەندوکۆسپەکانی دابەشبوونی قەڵەمڕەوی فیئۆدالی یان دەست تێوەردانی پێکهاتە کۆنەکانی دەوڵەت. فاکتەری دووەم گرنگی بەردەوام ڕوو لە زیادی بەڕێوەبردن بوو لە کۆمەڵگای مۆدێرندا، کە گرنگی‌یەکی بێ نموونەی بە زمان دەدا: (بیرۆکراتیەت پێکهاتەیەکە کە کاریگەری خۆی بەبێ بوونی زمانێکی یەکگرتوو بە کێشە دەزانێ)). فاکتەری سێهەم ڕێگایەك بوو کە بەپێی ئەو ((بازرگانی بوونەوەی کۆمەڵگا)) زەمینە بۆ یەکێتی زمانی بە زیاتربوونی تێکەڵاوی‌و پەیوەندی نێوان خەڵك لە ناوچە جیاوازەکاندا، پێك دەهێنێ، وە ئەم زمانە یەکگرتووەش شێوازێکی‌تر دێنێتە ئاراوە: ((هەمەگونی (یەکگرتوویی) )) بە دەگمەن لە ڕووی پەروەردەکردنەوە بەدەست دێت، بەڵکو زیاتر بەرهەمی فراوان بوونی پەیوەندی بازرگانی‌یە لەناخۆی دەوڵەتدا))(٤٢).

وە سەرەنجام ئەم مەسەلەیە هۆکارەکانی پێکهاتنی کێبەرکێ لە نێوان نەتەوە جیاوازەکانی ناویەك دەوڵەتدا ڕوون دەکاتەوە. کاتێك کە هێزە ئابووری‌یەکان بە ئەندازەی پێویست بەهێزو دەسەڵاتدار نەبوون کە قسەکەرانی زمانە جیاوازەکان ناچار بە فێربوونی زمانی نەتەوەیی بکەن، هەوڵەکانی حکومەت لەپێناوی سەپاندنی چوون یەکی زمانی‌دا دەبێتە هۆی دروست بوونی جیاوازی زیاتر لەنێوان گروپە زمانی‌یە جیاوازەکاندا. هەندێك لەژێر کاریگەری بەرەسمی ناسرانی زمانەکەیانەوە لە هەندێك ئیمتیازات بەهرەمەند دەبن، ئەم مەسەلەیە بەشێوەیەکی نەژادپەرستانە شانسی زیاتر لەپێناوی چوونەسەرەوەدا لە هەرەمی بیرۆکراتیەتدا بۆ ئەوانە

دەرەخسێنێ. بەڵام ئەوانەی زەرەرمەند دەبن لەم مەسەلەیەو ئەو مەیلەیار تێدا بەهێز دەبێت کە لەبەرامبەر ناسنامەی ڕەسمیدا، بگەڕێنەوە بۆ ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان: ((وەختێك کە لە ژیانی پیشەیی یان لە بەردە، دادگادا، زمانی زاڵ سوودمەند دەبێت، ئەندامانی نەتەوەکانی‌تر دەکەونە جێوشوێنێکی لاوازترەوەو زیان دەکەن... گەشەکردن و پێگەیشتنو مندااڵنی پیشەوەران و جووتیارانی‌ئەو نەتەوانەی کە بە زمانی ڕەسمی نادوێن، دووچاری کێشەی زۆرتر دەبێت))(٤٣).

بەم شێوەیە کاوتسکی سەبارەت بە پێکهاتنی نەتەوە ناکۆکەکان شیکردنەوەیەکی بەرهەم هێنا کە بە بەراورد لەگەڵ شیکردنەوەکانی باووردا مێژوویی‌ترو ماتریالیستی‌تر بوو- ڕەنگە هەر لەم ڕووەوە بێت کە ئەمڕۆ باوور لەلایەن ئەوانەوە کە مارکسیزم بە توندی دەدەنە بەر ڕەخنە کە گوایە ((تقلیل گرایە))و ((قومیت))و ((جنسیت)) لەبەرچاو ناگرێ، جێگای ڕێزو ستایشە(٤٤). بەڵام لە شیکردنەوەکانی خودی کاوتسکیشدا یەك کێشەی چارەسەر نەکراو هەیە. ئەو، سەرەڕای دووربینی‌یەکەی سەبارەت بە گۆڕانی گروپە نەتەوەیی‌یەکان بۆ ناسیونالیستەکان، گەشەکردنی ئابووری‌یانەی سەرمایەداری لە گۆشەیەکەوە دەبینێ کە دەبێتە هۆی خەباتی نەتەوایەتی. لە نووسینە سەرتایی‌یەکانی خۆیدا بەڵگەی دەهێنایەوە کە گەشەکردنی سەرمایەداری نەتەوەی چیك مەحکوم بە لەناوچوون دەکات. هەتا دوای ئەوەش کە وازی لەم بۆچوونەی خۆی هێنا، هەرەکو جاران بیری دەکردەوە کە بە جیهانی‌بوونی هەرچی زیاتری بازرگانی، ڕووبەڕووبوونەوە نەتەوەیی‌یەکانیش بەرەو لەناوچوون دەچن، ((بە هەمان ڕادە کە پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان هاوشان لەگەڵ پەرەگرتنی ئابووری‌دا، گەشە دەکەن، ئاست و ژمارەی ئەو کەسانەی کە بە یەك زمان دەدوێن زۆرتر دەبێت... پەیوەست بوونی نەتەوەکان بە کۆمەڵگای ڕۆشنبیری نێونەتەوەیی‌یەوە دووبارە خۆی لە گەشەکردنی زمانە گشتی‌یەکاندا لەنێوان بازرگانان و خەڵکی ڕۆشنبیرو خوێندەواردا، نیشان دەدات...))(٤٥).

له بۆچوونەکانی کاوتسکی‌دا ووردبینی ودووربینی لەبەرچاو هەیە، کە ئەوی بە مەحکوم کردنی باوەڕ سەبارەت بە هاندانی ناکۆکیە نەتەوەییەکان لە نێوان سۆشیالیستەکاندا، ڕێنوێنی کردووە: ((هیچ کاتێك پێکهاتنی فەرهەنگێکی نەتەوەیی وەك ئێستا مەحاڵ نەبووە. پاشان زۆر جێگای سەرسوڕمانە کەسانێك کە هەمیشە قسە لەسەر فەرهەنگێکی نەتەوەیی دەهێننە پێشەوە، ئامانجیشیان سۆشیالیزم بێت، کەچی فەرهەنگی نەتەوەیی بە کۆمەڵانی خەڵك دەناسێنن... کاتێك کە کۆمەڵگای سۆشیالیستی هەل و مەرجی خوێندن و پەروەردەی خستە بەردەستی خەڵکەوە، لە هەمان کاتیشدا ئەو توانایەشیان پێدەبەخشێت کە بتوانن بە چەند زمان، وە هەروەها بە زمانە گشتی‌یەکانیش بدوێن، وە بەم پێ‌یە لە تەواوی شارستانێتی جیهانی‌دا، نەتەنها لە فەرهەنگی جیاوازی کۆمەڵگایەکدا، زمانی تایبەت، گشتی دەکەنەوە))(٤٦).

بەلام ئەم دووربینی‌یە لە ناوەوەی شیکردنەوەی‌یەکی فراوانتردا شاردرابۆوە، تا ئەو رادەیەی بەرفراونی بە چەندەها شێوە کە سەرمایەداری بەپێ‌ی ئەوانە ناکۆکی‌یە نەتەوەیی‌یەکان لە چوارچێوەی دابین کردنی پێداویستی‌یەکانیاندا لە پێناوی سەرکەوتن بەسەریاندا، پێ‌دادەگرێ، بێ‌بەها دەبێت.

# ڕۆزا لۆكزامبۆرگ و لینین

ڕۆزا لۆكزامبۆرگ به بەراوورد لەگەڵ باوورو كاوتسكی‌دا لە شوێنێكی جیاوازترەوە دەستی بە كارەكانی كرد. ئەو تێدەكۆشا لەپێناوی بنیاتنانی حیزبێكی شۆڕشگێڕ لە پۆڵەندەدا. لەم وڵاتەدا بزووتنەوەی سۆشیالیستی لە ساڵەكانی دەیەی ١٨٩٠دا دووچاری لەتبوون ببوو، هەندێكیان– وەكو پیلووسكی، كە دواتر بووە دیكتاتۆری پۆڵەندا، بە خێرایی بەرەو ناسیونالیزم دەڕۆیشتن، وە بەشێكی‌تریشیان سەرسەختانە لەسەر هێڵی ئەنتەرناسیونالدا مانەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا كاتێك كە حیزبەكەی ئەو لە كۆنگرەكانی ئەنتەرناسیونالدا لەساڵی١٨٩٠دا و حیزبی كرێكارانی سۆشیال دیموكراتی ڕووسیا لە ساڵی ١٩٠٣دا، بەشداری كرد، زۆرینەی نوێنەرانی حیزب مافی سەربەخۆبوونی پۆڵەندایان پەسەند كرد، كە لە دیدی ڕۆزا لوكزامبورگەوە ڕازی بوون بوو بە نەیارانی ناسیونالیستی ئەو لە پۆڵەندادا. ڕۆزا تا دواساتی مردنیشی لە ساڵی ١٩١٨دا بە گەرمی‌و گوڕی‌یەوە درێژەی بە قسەوباسەكانی خۆی دا لەدژی هەر جۆرە ((مافی)) چارەی خۆنووسینێك لەپێناوی نەتەوەكان و لەدژی هەر جۆرە دەخاڵەتكردنێكی سۆشیالیستەكان لە ڕاپەڕینە نەتەوەییەكاندا.

لوكزامبورگ هەڵوێستی خۆی بە پشت بەستن بە چەند بەڵگەیەك كە پێكهاتەیەكی تێكەڵاو لە ڕەگەزە(عنصر)ەكانی بۆ چوونەكانی كاوتسكی و باوور بوو، پشتیوانی دەكرد. ئەو سەرچاوە یاخود ڕەگ‌و ڕیشەی ناسیونالیزمی ڕاستەوخۆ لە ئابووری دا دەبینینەوە_لە پێوستی‌یە ئابووری‌یی‌كانی ئەم یان ئەو چینی دەسەڵاتدارادا. لە لێكدانەوەكانی خۆیدا لە سەر ڕوون كردنەوەكانی كاوتسكی دەربارەی پەیدا بوونی ناسیونالیزم لە وڵاتانی وەك ئەڵمانیاو ئیتالیا دا بەتەواوی پی‌ی لە سەر ڕۆڵ و كاریگەری بورژوازی گەورە دادەگرت(٤٧). ئەو بەڵگەی دەهێنایەوە كە ئارەزووی ئەم بەشە لە بورژوازی بۆ بازارێكی ناو خۆیی ئەوانی بۆ

گەشەپێدانی بزوتنەوەی نەتەوەیی ڕێنومایی دەکرد، وەخەسڵەتێکی ریالیستیشی پێبەخشین.ئەو پاشان دەست بۆ ئەم شیکردنەوە (ئابووری‌یە)دەبات تا ناسیونالیزمی پۆڵەندایی سەدەکانی۱۹ و۲۰ی پێ ڕوون بکاتەوە:

ئەو بنەما مادییەی کە (لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا) ئیلهامبەخشی(مەسەلەی)نەتەوەیی بوو لە پۆڵەندا دا. بە پێچەوانەوی ئەورووپای ناوەندەوە رەگ و ریشەی لە گەشەکردنی سەرمایەداری مۆدێرنەوە وەرنەگرتبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە رەگو ریشەی لە بیروراوبۆچوونی ئۆرستۆکراتەکانەوە دەربارەی چینگاوشوێنی کۆمەڵاتی خۆی، و ریشەی لە ئابووری سروشتی فیئودالیەوە وەرگرتبوو.

بزووتنەوەی نەتەوەیی لە پۆڵەندا دا هاوکات لەگەڵ پەیوەندی‌یەکانی فیئودالیدا لە ناچوو، لە کاتێکدا بورژوازی لەم وولاتەدا لە بری قسەکەری گەشەکردنی سەرمایەداری، بەشێوەیەکی ئاشکرا فاکتەرێکی دژی نەتەوەیی بووە. ئەمە تەنها لەو رووەوە نەبوو کە بورژوازی رەچەڵەکێکی تایبەتی هەیە،بێگانە و ناتەبایە، وەبەرهەمی کۆلۆنیالیزمە، پێکهاتەیەکی‌نامۆیە کە لە پۆڵەندا دا چێنراوە، بەڵکو بەشێوەیەکی چارەنووسساز لەو رووەوش کە پیشەسازی وولات لە سەرەتاوە پیشەسازی‌یەکی ناردەنی(صادراتی)بوو...ناردن بۆ رووسیا....بنەمای هەبوون و هۆکاری سەرەکی گەشەکردنی سەرمایەداری لەپۆڵەندادا بوو... وە بورژوازی ئەم وڵاتەی هێنابووە ئاراوە. وەسەرئەنجام مەیلی سیاسی بورژوازی ئێمە بەرەو بورژوازی رووسیا بوو.. حوکمڕانی بورژوازی لە پۆڵەندادا نە تەنها پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی یەکگرتووی نەخستبووە بەرنامەی خۆیەوە،بەڵکو بە پێچەوانەوە پرەنسیپی خودی ئەو لە سەر داگیرکردن و دابەشکردنی وولات دارێژرا بوو. بیرۆکەی یەکێتی و سەربەخۆیی نەتەوەیی هێزی ژیانی و سەرەکی خۆی لە سەرمایەداری‌یەوە وەرنەگرتبوو: رێك بە پێچەوانەوە، لە رووی مێژووی‌یەوە ئەم بیرۆکەیە،

هاوکات لەگەڵ گەشەکردنی سەرمایەداری‌دا بەرەو دامرکانەوە و خامۆش بوون دەچوو.... لە پۆڵەنداادا لە نێوان بیرۆکەی نەتەوەیی و گەشەکردنی بورژوازی دا ڕووبەڕوو بوونەوەیەك پێکهاتووە کە نەتەنها خەسڵەتێکی خەیاڵاوی بەنەتەوە بەخشیووە، بەڵکو بەرگێکی کۆنەپەرستانەشی بەبەرداکردووە(٤٨).

لەدیدی لوگزامبورگەوە هەرکاتێك کە بورژوازی لە جێگایەکدا داواکاری دەوڵەتی نەتەوەیی نەبوو، لەو شوێنەدا کە دەوڵەتی نەتەوەیی بەشێکە لە گەشەکردنی سەرمایەداری، خودی بیرۆکەکەش کۆنەپەرست و مەحکوم کراو دەبێت.

رۆزالوکزامبورگ بۆچوونەکانی خۆی، کە لە سەرزەمینەی هەل ومەرجی پۆڵەندا دارشتبوو، گشتی(تعیم)کردەوە، ئەو بە دروستی بەڵگەی دەهێنایەوە ئەم بۆچوونەی کاوتسکی کە پێوستی‌یەکانی سەرمایەداری بە بازرگانی نێو نەتەوەیی،گەشەی ئاشتی خولزانەی دەوڵەتە نەتەوەییەکان لە پاڵ یەکتردا بە دیاری دەهێنێت، بە هەڵە دەزانی. لەبەرامبەردا ئەو پێ‌ی لە سەر ناتەبایی روو لە زیادی نێوان دەوڵەتەکان و ناچوونیەکی خەڵکی سەر بەم وولاتانەی، دادەگرت، ئەو باوەڕی وابوو کە دەوڵەتەکان خەڵکانێك دژ بە ئارەزووی خۆیان و بە زۆر دەیانبەستن بە خۆیانەوە:

ڕەوەندی گۆڕانی مێژوویی... نە لەمەیل بەئاراستەی بیرۆکەی یەك (دەوڵەتی نەتەوەیی)، بەڵکو لە کێشمەکیشی مەرگبار لە نێوان نەتەوەکاندا، لە مەیل بە ئاراستەی پێکهێنانی دەوڵەتی سەرمایەداری گەورەدا،ڕۆیشتوون و ڕووناکییان بینیووە.... بە پێچەوانەوەی دیدی کاوتسکی‌یەوە لە جیهانی هاوچەرخدا شێوازێك کە باشترین شێوە خزمەت بە بەرژەوەندی‌یەکانی‌وەبەرهێنان(استثمار) بکات، دەوڵەتی (نەتەوەیی)نی‌یە، بەڵکو دەوڵەتێکە کە بناخەکانی خۆی لە سەر داگیرکردن هەڵچنیبێ. کاتێك کە دەمانەوێت دەوڵەتانی جیاواز لە رووی نزیکیەوە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا بەراوورد بکەین...بۆ سۆراخی مۆدێلەکانی بەریتانیا و ئەڵمانیا دەڕۆین کە لەسەر چەوساندنەوەی نەتەوەیی لە ئەوروپا و شوێنانی تری جیهاندا

دامەزراوون– وەهەروەها دەچینە سەر وولاتە یەکگرتووکانی ئەمریکا کە هێشتا لە سەر سنگی‌دا زامی برینی چەوساندنەوەی ڕەشپێستەکان ساریژ نەبووە، خەریکی داگیرکردنی گۆمەڵگا ئاسیاییەکانە.

ڕۆزالوکزامبورگ بەو سەرنجامە دەگات، کە ئەم مەسەلەیە ئیمکانی دەست پێکردنی هەر بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی نوێ و چالاك لە ناودەبات:

گەشەی زلهێزەکانی جیهان، کە رووبەکی تایبەتمەندێتی دنیای ئەمڕۆیە، وەهاوشان لەگەڵ سەرمایەداری‌دا گرنگی‌یەکی رووڵەزیادی هەیە، لە هەمان دەستپێکی کارەوە تەواوی نەتەوە بچوکەکان بەسستی و بێ توانایی مەحکوم کردووە...(مافی چارەی خۆنووسین)، سەرهەڵدانی سەربەخۆی دەولەتانی بچوکتر، لە وەهمێك زیاتر هیچی تر نی‌یە، وەخەسڵەتی وەهمیانەی رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێت... ئایا دەتوانرێ بە شێوەیەکی جدی لە( مافی چارەی خۆنووسین)ی خەڵکانێکی وەك خەڵکی مۆنتنگرو،بولگارستان،خەڵکی رۆمانیا، سربەکان و یۆنانی‌یەکان... کە بە رووکەش سەربەخۆن، قسەبکەین؟ لەم بۆچوونەوە، بیرکردنەوە لە دانی هەر متمانەیەك یاخود زەمانەتێك لە بارەی ئیمکانی مافی چارە خۆنووسینەوە بە نەتەوەکان، یەکسانە لەگەڵ گۆڕانی ئاراستەدا لەگەشەی بەرفراونی سەرمایەداری یەوە بۆ دەولەتانی سەدە ناوەڕاستیە بچوکەکانی پێش سەدەکانی ١٥و١٦ (٤٩ ).

لایەنێکی خەسڵەت ئاشکرای ئەم بەشەی بەڵگەکانی لوکزامبورگ جۆرێکە کە ئەولە روونکردنەوەیەکی درەخشانی دیالکتیکی دا، دەربارەی رەوەندە ئابووری‌یەکانی سیستەمی سەرمایەداری، بە بۆچوونێکی بەتەواوی میکانیکی لە دەرەنجامە بەرهەم هاتووەکانی ئەم رەوەندانە دەگات–سەرمایەداری گەورە پێویستی بە خەبات ویاخی بوونە نەتەوەیی‌یەکان هەیە، بەپێی ئەمانە هیچ جێگایەکی لە ئیعرابدا نی‌یە. ئەمە بەو مانەیە نی‌یە کە هەڵوێستی ئەو ناکۆکی‌یەکی سادەبێت لەگەڵ

ناسیونالیزمدا.بۆچی که ئەو شیکردنەوەی (فراکاوتسکیستی) خۆی له رەگ و ریشـەکانی دەوڵـەتی نەتەوەییـەوە لەگـەڵ بۆچوونـەکانی بـاوەریدا سـەبارەت بە ناسـیونالیزمی فەرهـەنگی تێهەڵکێش دەکات.ئـەو بەرنامـەی باووری حیزبی سۆسیالستی نەمسا بـە تـێزی دابەشـکردنی دانیشـتوانی وولات بـە کۆمەڵـە گروپێکـی ئۆتۆنۆمـەوە پەسـەند دەکات. ئـەو(هەسـت و سۆزی نەتەوەیی) به بەشێك له(شێوازه بالاترەکانی دیارده دەروونییەکان) دادەنـێ، و مانـەوەی (ناسـنامەی نەتـەوەیی پۆڵـەندی)، تـا کـاتێك کـە سۆشیالیزم توانای والاکردنی(ناسـۆ تازەکـانی نـەبێت لـەپێناوی رزگـاری فەرهەنگی نەتەوەیی پۆڵەندی)دا ،پێشبینی مانەوەی دەکات (٥٠).
ئەوپڕوپاگەندەی ئەوە دەکات کە (مەسـەلەی ناسیۆنالیزم لـە پۆڵـەندەدا بـۆ کرێکاران مەسەلەیەکی نامۆ نییـە –و ناشتوانێ وابێت ) بۆچی وا بێت لە کاتێکدا (پرۆلیتاریا نـاتوانێت لـە بەرامبـەر چەوسـانەوەیەکی (نەتـەوەیی) درندانـەو بـێ ئـەندازه قورسـدا کـە دژ بـە پۆشـنبیران ومیراتی فەرهـەنگی کۆمەڵگادا دەکرێت ،بێ دەنگ رادەوەستێت ) (٥١).
ئەو بـڕوای وابـوو کـە ( پرۆلیتاریـا دەتوانێـت ودەبێـت لەبـەرگری لـە ناسنامەی نەتـەوەیی ،وەك میراتێکی فەرهـەنگی کە مافی ژیـانو مانـەوەی هەیەو دەبێت گەشـەش بکـات، بجـەنگێت )، بـەلأم دەڵێـت کـە (ناسـنامەی نەتـەوەیی نـاتوانێت بـە جیابوونـەوەی نەتـەوەیی ببێتـە جێگـای بـەرگری لێکردن ) (٥٢).
لینـین، پـاش ماوەیـەکی زۆر لـە نێـوان تیۆریسـینە کلاسـیکەکانی مارکسیزمدا مەسـەلەی نەتـەوەیی بە ئـاڵۆزترین گوزارشـتی تیـۆری دەخاتـە ڕوو(٥٣). لە دیدی ئەودا شیکردنەوەی ناسیۆنالیستە تازەکان ،کەهاوشانی گەشەی سەرمایەداری سەریان دەرهێنـابوو ،پرۆڤەیـەکی ئەکادیمیانە نـەبوو .ئیمپراتۆریـەتی ڕوسیا دەولـەتێك بوو کە لـە ڕووی بـەراورد کردنـەوە فـرە نەتـەوەیی تـرو پێکهاتەیـەکی هـەبوو کە زۆر قابیلی تەقینـەوە بـوو لـە چـاو نەمسـادا .شۆڕشـی١٩٠٥، دەبێـت بـە هـەمان ئەندازەی کرێکاران ، شۆڕشـی

کەمە نەتەوەکان، جووتیاران و بۆرژوازی لیبرالیش بێت .هەڵوێستی هەڵەی حیزبەکەی ئەوسەبارەت بە مەسەلەی نەتەوەیی، ستراتیژیەتی شۆڕشی ئەوانیشی لەنێو برد. ئەم مەسەلەیە ئەوی بۆ ناکۆکی و ناتەبایی یەکی توند لەگەڵ هەڵوێستەکانی ڕۆزا لوکسمبۆرگ وباووردا ڕاکێشا.

شیکردنەوەی لینین لەبارەی پەیدابوونی نەتەوەوە پشت ئەستوور بوو بە لێکدانەوە ماتریالیستی یەکانی کاوتسکی .لینین لە ساڵی ١٩١٤دا گووتی:

لە سەرتاسەری دنیادا ، دەورانی سەرکەوتنی یەکجاری سەرمایەداری بەسەر فیودالیزمدا لەگەڵ بزووتنەوە نەتەوەیی یەکاندا دووانە بوون . (لێرەدا نووسەر دەڵێت :"فیودالیزم بەسەر سەرمایەداریدا ..."کە پێم وایە هەڵەیەکی ئاشکرای وەرگێرانە رووسی یەکەیە بۆ ئینگلیزی ،یاخود کەمتەرخەمی یەکی ئەوانە –و:ف" بۆچی نا کە بۆرژوازی دەبێت لە پێناوی سەرکەوتنی یەکجاری بەرهەمهێنانی کالاّیی دا،بازاڕی ناوخۆیی فەتح کردبێت ؛دەبێت لەڕووی سیاسی یەوە ناوچە ئیداری یە ناوەندی یەکانی بەیەك زمانی هاوبەشەوە پێکهێنابێت، و تەواوی کۆسپەکانی تەکامولی ئەو زمانەو جێگیربوونیشی وەك زمانی ئەدەبی لەنێو بردبێت . بنەمای ئابووری بزووتنەوە نەتەوەیی یەکان لێرەدا شاراوەیە . زمان گرنگترین ئامرازی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانە. یەکێتی و تەکامول کردن بەبێ کۆسپ و رێگیری زمان گرنگترین مەرجی بازرگانی یەکی بە راستی ئازاد و پەرەگرتووە، لە پێوانەی گونجاوی سەرمایەداری مۆدێرندایە، زمان گرنگترین مەرجی گروپگیری ئازادو فراونی دانیشتوانە بە تەواوی چینە پێکهێنەرەکانیەوە، و سەرەنجام گرنگترین مەرجی پێکهێنانی پەیوەندی نزیکە لە نێوان بازاڕ و هەموو کەسێکی خاوەن(شمەك)دا، گەورە بێت یان بچوك،لە نێوان کڕیار و فرۆشیاردا.

لەم روەوەیە کە هەر بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی بەپێکهێنانی دەوڵەتی

نەتەوەیی، کە لە ریزی ئەو پێویستیانەی سەرمایەداری هاوچەرخدا بە باشترین شێوەی ئامادە وملێهاتووە، ئارەزووی هەیە.... بەم پێیە بۆ تەواوی ئەورووپای رۆژئاوا، (نابێت بگوترێت) کە بۆ تەواوی دنیای شارستانی، دەوڵەتی نەتەوەیی لە چاخی سەرمایەداری دا(دیاردەیەکی )ئاسایی و نموونەداره(٥٤).

بڵاو بوونەوەی جیهانی پەیوەندییەکانی سەرمایەداری، بەمانای هاتنەئارای زۆرترو زیاتری بزووتنەوە نەتەوەیەیکانە:

بەشی زۆری ئاسیا.... یان کۆلۆنی(ژێردەستە) زلهێزەکانە وەیان لە دەوڵەتانێك کە تا دوائەندازە ژێر دەستە بوون و نەتەوە ژێر دەستەکانن، پێکهاتووە.بەڵام ئایا ئەم مەسەلەیە، راستییەکی گومان هەڵنەگر کە هەر لە خودی ئاسیادا هەل و مەرج بۆ باشترین تەکامولی بەرهەم هێنانی کاڵایی و خێراترین گەشەی سەرمایەداری لە ژاپۆن- تاکە دەوڵەتێك کە لە سەر بنچینەی نەتەوەیی پێکهێنا تووە-رەخساوە،لەق دەکات؟ راستی نکۆڵی لێنەکراو ئەوەیە کە سەرمایەداری بە دواخستنی ئاسیا، بزووتنەوە نەتەوەییەکانی لەم کیشوەرەدا جڵەو کردووە، ئەم بزووتنەوانە ئارەزووی-مەیلی پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوییان هەیە،(ئەمەش بۆ خۆی راستییەکە)ئەم دەوڵەتانە باشترین هەول و مەرج لە پێناوی تەکامولی سەرمایەداری دا دەرەخسێنن....

دەوڵەتی نەتەوەیی بنچینە وقانوونی سەرمایەدارییە... لەروانگەی پەیوەندییە نەتەوەیی یەکانەوە،باشترین هەل و مەرج لە پێناوی تەکامولی سەرمایەداری دا دەوڵەتی نەتەوەیی دروستی دەکات. هەڵبەتە ئەمە ئەو مانایە نابەخشێ کە دەوڵەتی لەو چەشنە، کە بە پەیوەندییە بورژوازییەکان پشت ئەستوورە، دەتوانێ چەوسانەوە و ستەمی نەتەوەیی لە نێو ببات. ئەم مەسەلەیە تەنها بەو مانایەیە کە مارکسستەکان ناتوانن ئەو فاکتەرە ئابوورییە بە هێزانەی کە مەیل و ئارەزووی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەییان بەرهەم هێناوە، لە بەرچاونەگرن.

لینین لە ساڵی ١٩١٦ دا شیکردنەوەیەکی بەرهەم هێنا تا بەهۆیەوە هێرشی خۆی بۆ سەر کەسانێك دەست پێبکات کە بە شێوازی روزالوکزامبورگ بە سەرنجدان لە هۆیەکانی پەیوەندی لە نێوان تەکامولی سەرمایەداری و گەشەکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی دا ئەو دەرئەنجامەیان بە دەست هێناوە کە داواکاری‌یە نەتەوەیەکان بەپەرەگرتنی و بڵاوبوونەوەی پێشکەوتووترین دەوڵەتانی سەرمایەداری بە سڕینەوەی سنوورە کۆنەکانیان( خەیاڵاوی)و(کۆنەپەرستانە) دەردەکەون.

بەڕای ئەو ئەم کەوتنە نێو تەڵەزگە(ورطة )ی (ئیکۆنۆمیزی ئیمپریالیستی‌یەوە)هەوڵدانێك بوو بەمەبەستی کەم بەهارکردنی سیاسەت و کردنی بە بەرهەمێکی میکانیکی بێ ناوەند(واسطة)ی ئابووری . ئەو ووتی کە ئیکۆنۆمیزم بەم شێوەیە بەڵگە دەهێنێتەوە کە(سەرمایەداری سەرکەوتنی بە دەست هێناوە،بە پێ ی ئەم راستی یەش"دەست بردن" بۆ مەسەلە سیاسی‌یەکان کات بە فیڕۆدانە)، تیووری تازە دەڵێت کە (ئیمپریالیزم سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، لەم روەوە"دەست بردن" بۆ مەسەلە سیاسیەکان کات بە فیڕۆدانە). ئەم تیوری یە نا سیاسی‌یە بێ ئەندازە جێگای مەترسی دەبێت بۆ سەر مارکسیزم).

سەرەڕای ئەمانە، ئەو هەروەها ئەو بۆچوونە کۆنەی کارتسکیش، کە دەڵێ لایەنگرانی پەرەگرتنی سەرمایەداری نەتەوەیی، هەر خودی سەرمایەدارانن، قبوڵ ناکات. ئەو سەرنجی لەوەدا کە لە راپەڕینی ساڵی ١٩١٦ ی ئێرلەنی‌یەکاندا،(شەڕی سەرجادەکان چەندەها بەش لە وورده برژوازی و چەندەها بەش لە کرێکاران سەرپەرشتی یان دەکرد....)ئەو بەو سەرنجامە گەیشت کە:

پێشبینی‌کردنی شۆڕشی کۆمەڵایەتی بەبێ یاخی بوونی نەتەوە بچوکەکانی شوێنە داگیرکراوەکان و ئەورووپا، بەبێ تەقینەوە شۆڕشگێڕی‌یەکانی چەندەها بەش لە وورده بورژوازی، سەرەڕای دەست پێشخەریشیان، بەبێ بزووتنەوەی پرۆلیتاریا و خەڵکانی نیوە پرۆلیتا،

لــە ڕووی سیاســـیەوە ناهۆشـیار، لــە دژی ســتەمی زۆرداران، کڵێســا، پادشـایەتی و دژی سـتەمی نەتـەوەیی و هتـد، جگـە لـە نـەفی کردنـەوەی شۆڕشی کۆمەڵایەتی زیاتر هیچیتر نییە.

لینین لە شیکردنەوەکانی خۆیدابە چەند دەرئەنجامێکی سیاسی گرنگ گەیشت. ئەو لە مافی نەتەوەکان لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیاندا لە بەرامبەر ڕۆزا لوکزامبورگ و کەسانی وەک کارڵ رادەک و نیکولای بوخارین دا، کە بیروڕای لێکچوویـان هـەبوو، بـەرگری کـرد، بەرنامـەی "بـاووڕی" (ئۆتۆنۆمی ڕۆشنبیری نەتەوەیی) ڕەت کردەوە .
بەرگری لینین لە مافی نەتەوەکان لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیاندا لــە دووبـەش پێکـهاتبوو:بەشــی یەکـەم پـەیوەندی بەهەســتی سیاســی کرێکارانێکـەوە هەیـە، کـە لەگــەڵ دەسـەڵاتدارانی دەوڵـەتی چەوسـێنەردا هاونەتەوە بوون:
ئەگـەر ئێمـە لـە بانگەشـەو پروپاگـەندە سیاسـییەکانی خۆمـاندا لـە بـۆ پێشەوە بردن و بەرگری لە مافی جیابوونەوە کەمتـەر خەمبین، نـەک تەنها بە قازانجی بورژوازی بەڵکو بـە قازانجی زەویدارانـی فیـۆدال و دەسـتەڵاتدارە رەهاکانی نەتەوە چەوسینەرەکانیشدا کارمان کـردووە.... کـاتێک کـە ڕۆزا لوکزامبـورگ،لەبـەر ئـەوەی (کۆمـەکی)بـە بـورژوازی نەتـەوەیی پۆڵـەندا نـەکردووە، مـافی جیابوونـەوە لــە بەرنامـەی مارکسیسـتەکانی ڕووسـیادا ڕەت دەکاتـەوە، لـە ڕاسـتیدا کۆمـەک بـەباندە رەشـەکانی ڕووسـیای مـەزن دەکات ...مەسەلەی ئازادی خەڵکی ڕووسیای مەزن پێویستی بە خەباتێکی درێژخایانە دژ بە چەوسینەرێکی لەو جۆرە.... مێژوویـی یـەک بە درێژایی چەند سـەدە سـەرکووتی بزووتنـەوە نەتەوەییە ژێردەستەکان و بانگەشـەی سیستماتیک بە قازانجی ئەم سەرکووتکردنانە لەلایەن چینە سەردەستەکانی کۆمەڵگاوە، کۆسپ گـەلێکی لـە ژمـارە نەهاتووی، لـە شێوەیبیرکردنەوەدا، لەســـەر ڕێگـای ئـازادی خـــودی خــەڵکی ڕووســـیای مـــەزندا دانــاوە...

پرۆلیتاریای ڕووسیای مەزن بەبێ ئەوەی کە بەشێوەیەکی سیستماتیك بە سەر ئەم جۆرە بیرکردنەوانەدا سەرکەوێت، ناگاتە ئامانجەکانی خۆیی و ناتوانێت ڕێگای گەیشتن بە ئازادی خۆی خۆش بکات....

لەسەر زەمینی ڕووسیادا، پێکهێنانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی سەربەخۆ، بێگومان، بەشێوەی ئیمتیازێکی تایبەتی نەتەوەی ڕووسیای مەزن دەمێنێتەوە. ئێمە، پرۆلیتاریای ڕووسیای گەورە کە پشتیوانی هیچ جۆرە ئیمتیازێك نین،ئامانەوێ هەستین بە بەرگریکردن لەم ئیمتیازەش(٥٦).

لینین هەمیشە ئەم پروپاگەندەیەی کە گوایە وەها بۆ چوونێك بزووتنەوەی کرێکاری بەپێ ی هێڵە نەتەوەییەکان دووچاری دابەش بوون دەکات، ڕەت کردەوە وگوتی کە پێچەوانەکەی ڕاستە. ئەگەر کرێکارانی نەتەوەی ژێردەستە لە نێوان خەڵکانی نەتەوەی ستەمگەردا کەسێك نەبیننەوە کە بەرگری لە مافەکانیان بکات لە پێناوی یەکسانیدا، دووچاری داوای فریودەرانەی ناسیونالیستی بورژوازی و وورده بورژوازی خۆ وولاتی دەبنەوە. لەکاتێکدا کە ئەگەر ئەوان حیزبی کرێکارانی نەتەوەی ستەمگەر، بە بەرگری کار و پشتیوانی تەواو عەیاری مافی چارەی خۆنووسینی خۆیان بزانن، هۆشیار دەبن کە ئەو حیزبە لە بەرگری کردن لە بەرژەوەندییەکانی خودی ئەواندا هاتۆتە مەیدان و ئەو جا پشت دەکەنە بورژوازی و وورده بورژوازی خۆماڵی خۆیان. لینین بۆ سەلماندنی دروستی ئەم بۆ چوونەی خۆی جیابوونەوەی نەرویژ لە سوید لە ساڵی١٩٠٥ دا وەك بەڵگەیەك بە نموونە دەمێنێتەوە . ڕۆزا لوکزامبورگ بەڵگەی هێنا بۆ وە کە ئەم جیابوونەوەیە کۆنە پەرستانە بووە و ڕێك سیستەمێکی پادشایەتی لە جێگەی سیستەمێکی پادشایەتی تردا داناوە. لینین دەیگوت:

کە دەرئەنجامی ئەم جیابوونەوەیە و کارکردەکانی لە سەر کرێکاران هەنگاوێك نەبووە بەرەو دەسەڵات، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دووپاتی دەکردەوە کە جوڵانەوەی سۆشیالیستە سویدییەکان لە بواری پشتیوانی کردن لە مافی جیابوونەوەی نەرویژییەکان لە سوید، ئەوەی مسۆگەر کرد

که ئەم جیابوونەوەیە هەنگاوێك نەبێت بەرەو دواوە:

هاوکاری نزیکی کرێکارانی نەرویژیو سویدی لەگەڵ یەکتردا، هاوپشتی برایانەی چینایەتی ئەوان، سەرچاوەی بەرەسمی ناسینی مافی جیابوونەوەی نەرویژی یەکان بوو. خودی ئەمە کرێکارانی نەرویژی دڵنیاکرد کە کرێکارانی سویدی ئالودەی ناسیونالیزمی سویدی نین و برایەتی خۆیان لەگەڵ کرێکارانی نەرویژیدا بە باشتر لە ئیمتیازاتی بورژوازیو ئۆرستۆکراتی سویدی دادەنێن(٥٧).

سۆشیالیستەکانی نەتەوەی سەردەستە بە پشتیوانییان لە مافی چارەی خۆنووسین، ئەنتەرناسیونالیزمیان بەهێزکرد لەنێو کرێکارانی وڵاتی خۆیان و هەروەها لەنێو کرێکارانی وڵاتی ژێردەستەشدا: (لەڕاستیدا داننان بە مافی تەواوی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا، نیشانەی هەبوونی لایەنی زۆری دیموکراسی و لانیکەمی ناسیونالیزمە(٥٨).

یەکەمین بەڵگەی لینین لەو هەنگاوەیدا لەپێناوی پەرەپێدانی دروشمی مافی چارەی خۆنووسین، لە بنەڕەتدا پەیوەندی بەو خەباتەوە هەبوو کە لەدژی بیروباوەڕە کۆنەپەرستی یەکان لەنێو چینی کرێکاری نەتەوەی سەردەستدا بەڕێوە دەبرا. ئەمە ئەو مانایە ناگەیەنێ کە ئەو هەل و مەرجە تایبەتی یەکان لەبەرچاوناگرێ، ئەو دەیزانی کە ڕەنگە لە هەندێ بواردا بە خراپی سوود لەم دروشمە وەربگیرێ (هەروەکو مارکس ووتبوی کە چیکەکان و سلاڤی یە باشووری یەکان لە ساڵی ١٨٤٨دا خراپ سوودیان لێوەرگرت):

ناتوانرێ هیچ یەکێك لەم خواستە (دیموکراتیك)یانەت هەبێت کە، لە سایەی هەل و مەرجێکی دیاریکراودا، نەبنە ئامرازێك بەدەست بورژوازی یەوە لەپێناوی خەڵەتاندنی کرێکاراندا، وە یان لە ڕاستیدا ڕۆڵێکی لەو جۆرەیان نەبێت... لەبواری کردەوەدا پرۆلیتاریا کاتێك دەتوانێ سەربەخۆیی خۆی بەدەست بێنێت، کە خەبات و تێکۆشانی خۆی لەپێناوی

تـــەولوی داخوازی‌یـــە دیموکراتیکـــەکاندا، ببەســـتێتەوە بـــە خـــەباتی شۆڕشـگێڕانەی خۆیـەوە لـەپێناوی سـەرنگون کردنـی بـورژوازی‌دا.... لـە سەرێکی‌تریشەوە مارکس... (کە) بنەما سەرەکی‌یەکانی ئەنتەرناسیونالیزم و سۆشیالیزمی لەپێش هەموو شتێکی ترەوە دادەنا، دەیگوت کـە هیـچ نەتەوەیەك لە حاڵەتی چەوساندنەوەی نەتەوەکانی‌تردا، (خۆیشی) ناتوانێت ئازاد بێت.

سەرەنجـام ســـەرەکی‌ترین بەڵگـەی لینـین خەســـڵەتێکی-گـــەرچی تەواوبێ بی‌قەیدوشەرت نەبوو- گشتی هەبوو. ئەو بەڵگەی‌تریشی تێکەڵاو بـە بەڵگـە ســەرەکی‌یەکەی دەکـرد، کـە لـە هـەل و مـەرجێکی کۆنکرێتـی دیاری‌کراودا پـەیوەندی بـە کاریگەری‌یـەکانی خەباتـەوە هـەبوو لـەپێناوی مـافی چـارەی خۆنووسـین بـۆ نەتـەوە ژێردەسـتەکان. ئـەم بەڵگانــە زیــاتر پەیوەندی‌یان بـە سـتراتیژی‌و تاکتیکـە شۆڕشـگێڕانەکانەوە هـەبوو، تـا بـە پرەنسیپەوە(اصول).

پشتیوانی‌کردن لە مافی چارەی خۆنووسین بە ناچاری بە مانای بە چاکتر زانینـی جیابوونـەوەی نەتەوەیـەك لـە دەوڵـەت نـەبوو. سۆشیالیسـتەکانی وڵاتـی ستەمگەر دەتوانـن، وەك ڕێگایـەك لـە خـەباتدا لـەدژی بیروبـاوەڕی کۆنەپەرستی لـەپێناوی مـافی جیابوونـەوەدا تێبکۆشـن؛ لـەکاتێکدا کـە سۆشیالیستەکانی وڵاتـی ژێردەستە دەتوانن کرێکاران بهێننـە سـەر ئـەو باوەڕەی کـە ئـەیاری جیابوونـەوە بـن- هـەروەکو چـۆن کـە مـافی (طـلاق) مەسـەلەی ژیـانی هاوبـەش بـۆ هـەردوو ژن و مـێرد دیـاری دەکـات، کـە بـە شێوەیەکی ئازادانە لەو بارەیەوە بڕیار بدەن:

ئەم داواکاری‌یە (واتـە داخـوازی مـافی چـارەی خۆنووسین) یەکسـانە بـە مافی جیابوونەوە، لەت لەت کردن و پێکهێنانی دەوڵەتە بچوکەکان نی‌یە ... هـــەتا سیســـتەمێکی دیمکراتیکـــی دەوڵـــەتی بـــە ئـــازادی لـــە پێنـــاوی جیابوونـەوەی تـەواودا نزیکـتر بێتـەوە، لـە بـواری پراکتیکیـدا داخـوازی بۆ جیابوونەوە کەمترو ناخوازراوتر دەبێت....(٥٩).

لەبەر ئەم هۆیانە بوو کە خەبات لە پێناوی بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی نەتەوەیەکی ژێردەستەدا، هەتا ئەگەر لە ژێر رابەری بورژوازی وەیان وورده بورژوازیشدا بێت، کۆمەکی بە خەباتی چینی کرێکاری جیهان دەکرد. چونکە خەباتێکی لەو چەشنە هۆکاری لاواز بوونی دەوڵەتی پادشایەتی و چینی دەسەڵاتدارەکانیان دەبێت. لینین لەو باوەڕەدا بوو کە راپەڕینی سالی ۱۹۱٦ی ئیرلەندی‌یەکان و، راپەڕینە(چاوەڕوان)کراوەکانی خەڵکی ژێردەستەی رژێمی تزاری وئیمپریالیستەکانی رۆژئاوا، کە ئەو بە دروستی روودانیانی لە سەرئەنجامی جەنگی جیهانیدا پێش بینی دەکرد، بەشێك بوون لەم دەستەیە.لەم بوارەدا نە تەنها سۆشیالیستەکانی نەتەوەی ستەمگەر دەبێت بەرگری‌کاری ماڵ جیابوونەوەبن، بەڵکو سۆشیالیستەکانی نەتەوە ژێردەستەکانیش دەبێت بە شێك بن لە خەبات لە پێناوی جیابوونەوەدا.(ئەگەر ئەمانەوێت پشت لە سۆشیالیزم بکەین، دەبێت لە هەموو جۆرە راپەڕینێکدا، تەنها بەو مەرجەی سەر بە چینە کۆنەپەرستەکان نەبێت، دژ بەدوژمنی سەرەکی و بنەڕەتی خۆیان، بورژوازی دەوڵەتەگەورەکان، پشتیوانی دەکەین)(٦٠).

ئەگەر چی رووداوە لە هەندێك حاڵەتیشدا کە سۆشیالیستەکان ناچار بوون کە دژ بە پروپاگەندە ناسیونالیستی یەکان نەبن، بۆ نموونە کاتێك کە بزووتنەوەی نەتەوەیی پۆڵەندا، لە هەل و مەرجی جەنگی جیهانی یەکەمدا، کاتێك کە ئیمپریالیزمی ئەڵمانی بە شێوەیەکی قووڵ رووبە رووی کێشمەکێشێکی ئیمپریالیستی ببۆوە لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا و رووسیادا.

بورژوازی کە بە شێوەیەکی گشتی لە سەرەتای هەموو بزووتنەوەیەکی نەتەوەییدا رابەری ئەو بزووتنەوەیە بە موڵکی خۆی دەزانێت، دەڵێت کە پارێزگاری لە تەواوی ئارەزووە نەتەوەییەکان، پەیوەندی بەبازنەی کردارەوە هەیە(ئەم دەربڕینە لە دەقە ئینگلیسی‌یەکەدا مانای عەمەلیش دەبەخشێت-و٠ف) لە کاتێکدا سیاسەتی پرۆلیتێری لە مەسەلەی

نەتەوەییدا(وەك هەرمەسەلەیەكی‌تر) تەنها لە هەندێك بواری دیاری كراودا یارمەتی برژوازی دەدات،بەڵام هیچ كاتێك خۆی هاوشانی سیاسەتەكانی بورژوازی ناكاتەوە.......

داواكردنی وەڵامێك بە(بەڵێ)یان(نەخێر)سەبارەت بە مەسەلەی جیابوونەوەی هەر نەتەوەیەك لە رووی تیووریەوە مەسەلەیەكی(عەمەلی)یە. بەڵام لە دنیای واقعی دا ئەمە قسەیەكی پووچە...لە پراتیكدا (تێپوانینێكی لەم جۆرە) دەبێتە هۆی كلكایەتی پرۆلیتاریا بۆ بورژوازی. پرۆلیتاریا هەر داخوازیەكی نەتەوەیی،هەر جیابوونەوەیەكی نەتەوەیی لە گۆشەنیگای خەباتی چینایەتی كرێكارانەوە هەڵدەسەنگێنێ(٦١). پێش بینی كردنی تەواوی پەیوەندی یە شیاوەكان لە نێوان بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی بورژوازی نەتەوەی ژێردەستە و بزووتنەوە پرۆلیتاریەیە ئازادیخوازەكانی نەتەوەی ستەمگەردا، ناموكینە(٦٢).

ئەم خاڵە ئێمە بەرەو لایەنێكی سەرەكی‌تری هەڵویستی لینین سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوەیی رادەكێشێ-لایەنێك كە بە زۆری لەلایەن لایەنگرانی بزووتنەوە نەتەوەییەكانەوە كە بە درێژی ووتەزاكان(مقولات)ی لینین سەبارەت بە مافی چارەی خۆنووسین دەهێننەوە، پشت گوێ خراوە. لینین ئوتۆباور لەبەرتێزەكەی سەبارەت بە(ئۆتۆنۆمی رۆشنبیری نەتەوەیی)كە ئیمتیازاتێك بە ناسیونالیزمی بورژوازی دەدات- و هەروەها لوگزامبورگ تا ئەو ئاستەی كە هاورایی خۆی لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا دەردەبرێ، مەحكوم دەكات.

بۆ یەكەمین جار دایەلۆگ لە ناو بزووتنەوەی سۆشیالیستی رووسیادا لە ساڵی١٩٠٣دا لەچوار چێوەی كۆنگرەی دووەم( لەراستی‌دا كۆنگرەی دامەزراندن)ی حیزبی كرێكارانی سۆشیال دیمكراتی رووسیادا دەستی پێ كرد.. لەوكاتەوە تاكو ئێستاش بزووتنەوەی سۆشیالیسی لە نێوان چەندەها بەش لە كرێكارنی جوولەكەدا لە رۆژئاوای

ئیمپراتۆریەتی ڕووسیادا بە هێزتربوو لە بەشەکانی تری جەماوەری کرێکاراندا. بەشێکیان کە بەکاری ڕێکخستنی کرێکاری جوولەکەوە خەریک بوون،حیزبێکی سۆشیالیستی تایبەت بە جوولەکەنیان- بۆند- دروست کردبوو، کە دەیگوت دەبێت کرێکارانی جولەکە ڕێکخراوی جیای خۆیان هەبێت و پرۆپاگەندەکانیان لە بازنەی هەبوونی قوتابخانە و ڕێکخراوە جیاوازەکانی جولەکەدا دەخولایەوە. نە تەنها مارکسیستە ڕووسەکانی وەك لینین و بلیخانۆف، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر لەبەناوبانگ ترین مارکسیستە جولەکەکانی تروتسکی و مارتۆڤیش ناکۆك بوون لە گەڵیدا. بۆ نموونە مارتۆف دەیگوت کە تەسلیم بوون بە داخوازییەکانی بۆند، بەمانای لاوازکردنی ڕێکخراوە سۆشیالیستیەکانە لە هەر شوێنێکی کار و لە هەموو کەرەکێکدا:-

ئێمە ناتوانین ڕێگە بدەین کە هەر بەشێك لە حیزب بتوانێت نوێنەرایەتی گرۆپێك، پیشەیەك یان بەرژەوندی یە نەتەوەیی‌یەکانی بەشێك لە پرۆلیتاریا لە ئەستۆ بگرێ، جیاوازی‌یە نەتەوەییەکان لە پەیوەند بە بەرژەوەندی‌یە چینایەتی هاوبەشەکاندا، ڕۆڵێکی لاوەکی هەیە. ئێمە خوازیاری جۆرە ڕێکخراوێکین،ئەگەر بۆ نموونە، کرێکارانی نەتەوە جیاوازەکان لە یەك شوێنی کاری دیاری کراودا باشترو باڵاتر لە هەر شتێکی‌تردا بەرژەوەندی‌یە نەتەوەیی‌یەکانیان نوێنەرایەتی بکەن(٦٣).

لینین ئەم بەڵگەیەی هێنایەوە، بۆ نیشاندانی جیاوازی ئاشکرا لە نێوان خەبات لە دژی هەڵاواردن، لە سەر بنەمای زمان یان ڕۆشنبیری، دژ بە هەر گرۆپێك و ستایش کردنی ڕۆشنبیری یە نەتەوەیی یە تایبەتەکان، بە مەبەستی خەبات لە دژی تەواوی دەزگای تیۆرلینینی باووردا بە گشتی کردەوە.

بنەرەتی ناتەبابوون لەگەڵ نەژادپەرستی و چەوسانەوە لە سەر ئەو گرۆپانەی کە فەرهەنگێکی نەتەوەیی جیاوازیان هەیە، سۆشیالیستەکان ناچار دەکات تا لە پێناوی پەروەردەکردنی منداڵانی ئەم گروپانەدا

بە زمانی دایکی خۆیان، لە پێناوی قسەکردن بەزمانی خۆیان لە دادگاو ناوەندە دادگایی یەکانی تردا، و لە دژی بوونی بیرۆکەی گۆڕانی زمانی زاڵ بە (زمانی رەسمی)کە هەموان دەبێت لە بەرامبەری دا کڕنوش بەرن، خەبات بکەن)

هەرکەسێك کە یەکسانی نەتەوەکان و زمانەکان بە رەسمی نەناسێ، وەلە پێناویاندا خەبات نەکات، لە دژی ستەم و نایەکسانی نەتەوەیی نەجەنگێت، ناتوانێت مارکسست بێت، کەسێکی ئاوەها تەنانەت ناتوانێت دیموکراتیش بێت(٦٤).

لەهەمان کاتدا سۆشیالیستەکان نابێت خۆیان لەگەڵ هیچ فەرهەنگێکی نەتەوەیی یەوە، تەنانەت فەرهەنگی نەتەوەیی چەوساوەکانیش، بە هاوشوناس دابنێن:

دوور خستنەوەو بێبایەخ کردنی نێڵەی فیئۆدالیزم، تەواوی ستەمە نەتەوەیی و ئیمتیازاتێك کە هەر نەتەوەیەك یان هەر زمانێکی تایبەتی لێیان بەهرەمەند بوون، ئەرکێکی لوژیکی و مێژووی پرۆلیتاریایە وەك هێزێکی دیموکرات، ئەمە بێ گومان خەباتی پرۆلیتاریا سەرەڕای ئەو بلێ و نەلێ درزێوانەی کە چوار دەوری مەسەلەی نەتەوەییان داوە، کۆمەك دەکات. بەڵام کۆمەك کردن بە ناسیونالیزمی برژوازیواوەتر لەم چوار چێوەیە کە لە رووی مێژوویی یەوە دیاریکراو و بە ووردیش سنووردارە، بەمانەی پشتکردنە پرۆلیتاریا و هاوڕێیەتی بورژوازییە. لێرەدا خەت و سنوورێك هەیە کە بە زۆری بۆندیستەکان و ناسیونالیستە- سۆشیالیستە نۆکرانییەکان لێرە دا بە تەواوی بێ توانانان لە بینینی. لە دژی تەواوی ستەمە نەتەوەیی یەکان بجەنگین؟ بەڵێ، هەڵبەتە ! لە پێناوی گەشەی رۆشنبیری، لە پێناوی(رۆشنبیری نەتەوەیی)بە شێوەیەکی گشتی خەبات بکەین؟ هەڵبەتە ئەمەیان نا!

تەکامولی نەتەوەیی بە شێوەیەکی گشتی پرەنسیپێکی بنەڕەتی ناسیونالیزمی بورژوازی یە، ئەمە بەمانای ناسیونالیزمی

بەرچاوتــەنگی بورژوازیانەیــە، بــەمانای ووردە شــەڕە نەتەوەیی‌یــە بــێ کۆتاییەکانــە. پرۆلیتاریــا لــە پێکــهێنانی تــەکامولی نەتــەوەیی هــەر نەتەوەیەکدا بەتەواوی هۆشیار بووە، بە پێچەوانەی خەڵکەوە لە بەرامبەر ڕەهەم و خەیاڵاتێکی لەو چەشنەدا هۆشیاریان دەکاتەوە و هەمەلایەنترین کەشــەی ســەرمایەداری بــەلاوە پەســەندە و بەهــەر جۆرێــك ڕاکێشــانی نەتــەوەکان، جگــە لەوانــەی کــە زۆر یــان بــە دانــی ئیمتیــاز پێیــان پشــت ئەستوورن، دەڵێت بە خێر بێن(٦٦).

لەناو هەر نەتەوەیەکی مودێڕندا دوو نەتەوە بوونی هەیە- ئێمە ئەمە بە تەواوی ناسیونال- سۆشیالیستەکان دەڵێن.لە هەر فەرهەنگێکی نەتەوەییدا دوو فەرهەنگی نەتەوەیی دروست دەبێت....

ئەگەر مارکسیستی ئۆکرانی ڕێگا بە خۆی دەدا تا ئەو ئاستە بکەوێتە ژێر کاریگەری نەفرەتی رەوا و سروشتی خۆیەوە لە پەیوەند بە ستەمگەرانی ڕووسیای مەزندا کە هــەتا تۆزقاڵێك لەم نەفرەتــە.. بــە فەرهــەنگ و کــاری پرۆلیتێری کرێکارانی ڕووسیای مــەزن بگەیــەنێت یــان بگوێزێتــەوە، ئــەوا گرفتاری ناسیونالیزمی بورژوازی‌یە.

کرێکــارانی ڕووســیای مــەزن و ئۆکرانیــا دەبێــت بــە هاوڕێیــەتی یەکتر ... لەپێناوی گەیشتن بەیەك فەرهەنگی هاوبەش یان نێو نەتەوەیی بزووتنەوەی کرێکاری هەڵبسوڕێن و سەبارەت بەو زمانەش کە بەناچاری‌لە بانگشەکەندا بەکاری دەهێنین، پێویستە حەوسەڵەیەکی رەها و بێ سنوور لە خۆیان نیشان بدەن....پشتیوانی لە جیابونەوەی کرێکارانی نەتەوەیەك لــــە کرێکـــــارانی نەتەوەیـــــەکی‌تر، کەمپـــــەین- شـــــڵاو دژ بە(راکێشانی)مارکسیستی، و تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە پرۆلیتاریاوە هەیە، هەوڵدان بە ئاراستەی بەرەنگاری کردنەوەی فەرهەنگێکی نەتەوەیی لە تێکرای ئەولاندا لەگەڵ فەرهــەنگێکی نەتــەوەیی تــردا کــە پڕوپاگــەندەی تەکامولی فەرهەنگەکەی خۆی دەکات و..هتد، ناسیونالیزمی برژوازی‌یە و زۆر پێوستە لــە دژی‌یــان خــەباتێکی بێبەزەییانــە ببەینــە پێشــەوە(٦٧).

چەند تووخمێك لە فەرهەنگی دیموکراسی سۆشیالیزم، هەتا ئەگەر لە شێوەیەکی سەرەتایشیاندا بێت، لە هەر فەرهەنگێکی نەتەوەیی‌دا هەیە؛ بۆچی نا کە هەر نەتەوەیەك دیسان لە خەڵکانی زەحمەتکێش پێك دێت کە هەل و مەرجی ژیانیان، ڕێگاخۆش دەکات بۆ ئایدۆلۆژیای دیموکراسی‌و سۆشیالیزم. بەلام هەر نەتەوەیەکیش خاوەنی فەرهەنگێکی بورژوازی‌یە، نەك لە شێوەی ((چەند تووخمێکدا)) بەڵکو لە شێوەی فەرهەنگی زاڵدا، دەردەکەوێت (وە زۆربەی نەتەوەکان خاوەنی فەرهەنگێکی کۆنەپەرستانەی پەیوەست بە ڕۆحانیەکانن).

ئێمە لەپێناوی بردنەپێشەوەی دروشمی ((فەرهەنگی نێونەتەوەیی دیموکراسی‌و بزووتنەوەی جیهانی چینی کرێکار))، لە هەر فەرهەنگێکی نەتەوەیی‌دا بە تەواوەتی تووخمە دیموکراتیك و سۆشیالیستی‌یەکانیان وەردەگرین، ئێمە ئەم تووخمانە بە تەواوەتی‌و بە ڕەهایی لە دژایەتیا: لەگەڵ فەرهەنگی بورژوازی‌و ناسیونالیزم، بورژوازی هەر نەتەوەیەکدا خاوەندارێتی لێ دەکەین(٦٩).

لینین دەست نیشانی کرد کە سۆشیالیستەکانی وولاتێکی ستەمکەر دەبێت بەتەواوی ئاگاداری هەڵوێستیان سەبارەت بە مەسەلەی (ڕاکێشان - جذب)بن: دەبێت بگوترێت ئەگەر سۆشیال دیموکراتیك لە نەتەوەیەکی گەورەدا، ستەمگەرو لکێنەر (الحاق گەر)- لە چوارچێوەی ئەوەی کە دەبێت لە تواندنەوەی نەتەوەکان لەگەڵ یەکتریدا بەشێوەیەکی گشتی پشتیوانی بکات- تەنانەت هەتا بۆساتێکیش بووە نابێت ئەوە فەرامۆش بکات کە نیکۆلای دووهەم ((یان))، و یلهلم((یان)) ژۆژ((یان))،... هتد دیسان لایەنگری تواندنەوە بوون لەڕێگای لکاندنەوە، دەبێتە تیوریسیەنی گاڵتەجاڕ لە ئاستی تیوری‌داو یارمەتیدەری ئیمپریالیزم لە بواری پراکتیکیدا. ئەمە ئەرکی ئێمەیە کە کرێکاران فێربکەین کە سەبارەت بە جیاوازی نەتەوەیی بێ‌دەنگ بن یان بێ‌لایەن بن... بەلام ئەم بێ‌لانی‌یە نابێت لەو جۆرەی بێ‌لایەنی لکێنەران بێت (٧٠).

لینین ڕێك بۆ ئەوەی ئەم خاڵە بسەلمێنێ، پشتیوانی لە مافی چارەی خۆنووسین و جیابوونەوە دووپات دەکردەوە. ئەگەرچی لە هەمان کاتیشدا سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ((سۆشیال دیموکراتی نەتەوەی بچووك دەبێت لە پڕوپاگەندەی خۆیدا... پێ لەسەر ((یەکپارچەیی ئارەزوومەندانە)) دابگرێ. وەها سۆشیال دیموکراتیکێك لەوانەیە بەبێ ئەوەی لە ئەرکەکانی خۆیدا وەك ئەنتەرناسیونالیستێك کەمتەرخەمی بکات، لایەنگری سەربەخۆیی سیاسی نەتەوەیی بێت یان لە پەیوەست بوونی ئەوان بە دەوڵەتی دراوسێی ئەلف، ب یان ج پشتیوانی بکات. ئەو بە هەر حاڵ دەبێت بە هەر شێوەیەك لەدژی ((بەرچاوتەنگی)) تەنهایی و دەرگا لەسەرخۆ داخستنی نەتەوەی بچوك خەبات بکات...))(٧١).

ئەم تێبینییانە بوونە هۆی ئەوەی تا لینین بە توندی دژایەتی باسەکانی ((ئۆتۆنۆمی فەرهەنگی نەتەوەیی)) بکات. ئەو بەڵگەی ئەوەی هێنایەوە کە سیستەمی خوێندنگەی جیاواز بۆگروپە نەتەوەییە جیاوازەکان، دەبێتە هۆی جیابوونەوەی کرێکاران لە یەکتری:

لە نێوان ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی کۆمپانیا هاوبەشەکاندا، سەرمایەدارانێك لە نەتەوە جیاوازەکان دەبینین کە لەگەڵ یەکتر لە هاوکارییەکی تەواودا بەسەر دەبەن. لە کارخانەکاندا کرێکارانی نەتەوە جیاوازەکان لەپاڵ یەکتردا کار دەکەن. لە هەر مەسەلەیەکی جدی و سیاسی گرنگدا هەڵوێستەکان لەسەر بنەمای چینەکان نەك نەتەوەکان وەردەگیرێ. هێنانە دەرەوەی پەروەردەی خوێندنگاکان لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەت و سپاردنیان بە نەتەوەکان لەڕاستیدا هەوڵێکە لەپێناوی جیاکردنەوەی ئابوورییەکاندا، کە یەکخەری نەتەوەکانە، لە بالاترین شانەی ئایدۆلۆژی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، ناوەندێك کە تێیدا فەرهەنگی نەتەوەیی ((تەواو)) یان تەرویجی ناسیونالیستانەی دەسەڵاتی دەزگای ڕۆحانیەت و شۆڤینیزم بە ئازادانەترین شێوە ڕۆڵی خۆی دەبینێت(٧٢).

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١- ئـەریك هۆبسـباوم، نەتـەوەو ناسـیونالیزم لـە ١٨٧٠ بـۆ ١٩٧٠ (کمبریج، ١٩٩٠ ).

٢- ب- ئاندریسن، کۆمەڵگا خەیاڵییەکان( لندن، ١٩٩١ ).

٣- ئای گلنر، نەتەوە و ناسیونالیزم( ئاکسفورد، ١٩٨٣).

٤- ئان هریس، رزگاری نەتەوەیی(لندن، ١٩٩٠ ).

٥- لەم بارەیەوە نموونەی دیاریکراو مێژووی ترانسیاوانییە، نووسینی ئیس پاکۆ( نیویورك ١٩٩٠).

٦- ئای ئارگیلی،( گرنگـی لـەندەن ١٦٥٠-١٧٥٠) لـە ئینگلستانی پێش شۆڕشی پیشەسازیدا، ئەدیت جیپتن.

٧- ئـەم خاڵـە گرامشـی باسـی دەکـات، ر.ك. گرامشـی،( رێنیسـانس) هەڵبژاردە لە نووسینە کلتورییەکان( لەندەن،١٩٨٥).

٨- لەم روەوە بوو کە گرامشـی، ماکیاڤیللی، بەناسـاندنی بـەوەی کـە بـۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی بە شوێن شـازادەیەکی فیئۆدالـدا دەڕوات، وەك تیئوریسینی بورژوازی لە حاڵەتی لاداندا دەیبینێ.

٩- دەڵێن کە لـەم بڕیارەدا رۆڵـی سـەرەکی و بنـەڕەتی ئالسـاندرۆ مـازینی خسـتیە ئەسـتۆی خـۆی کـە رۆمانـە گرنگەکـەی خـۆی، بەشـێوە زمـانی لومباردی نووسی و بۆ ماوەی ١٥ ساڵ وەك سروود لە تۆسکان دەخوێندرا. بـۆ نموونـە ر.ك. دی ئیـم. نـاسمیت، ئیتالیـا: مێـژووی هاوچـەرخ (مێشیگان، ١٩٥٩).

١٠- ئـای بنـاك، کێشـەی نەتـەوەیی لـە یوگسـلافیا: سـەرچاوە، مێـژوو سیاسـەت(لـەندەن، ١٩٨٥)، هـەروەها ك.ر.ای. هۆبسـباوم. سـەرچاوەی پێشوو.

١١- جی بەرنان، گریێ کوێرەی ئیسپانی( لەندەن، ١٩٦٠ )ل ٢٩.

١٢- ئەم زاراوەیە رەخنە گرێکی خاوەن نفوذ و کاریگـەر بەکاریهێنا، کـە

کەم و زۆر کورتەیەکی دروست بوو لە ناسیۆنالیزمی ئابووری ئەو، کە لەسەر بەرهەمەکانی فردریش لیستی ئەڵمانی نموونە بەرداری کراوە. ر.ك. ئان ڤانیسبرك، کێشەی ئیرلەندا( لەندەن، ١٩٦٥ )ل ٢٩ .

١٣- ر.ك.ب فیتیچ و ئیم ئینهایمەر، گانا، کۆتایی وەهمێك ل ٣٣ و ل ١٨٢ -١٨٣ .

١٤- دژە شۆڕش لە بەرلین، نویەراینیشە زایتونگ، ١٢ نۆڤمبەر ١٨٤٨ ، دانراوەکانی مارکس و ئەنگلس، بەرگی ٨ ( مۆسکۆ، ١٩٧٧ ). ل١٧ .

١٥- ئا. باوور، کێشەی نەتەوەیی و سۆشیال دیموکراسی ل ٢٧١، لە ڕودۆلسکی‌یەوە وەرگیراوە، ئەنگلس و خەڵکی( ئامێژوویی) (١٩٨٧) ل ٣٥ .

١٦- ب ئاندرسن، هەمان سەرچاوە ل ٨٧ .

١٧- ك. مارکس و ف ئەنگلس، مانیفیستی پارتی کۆمۆنیست، مارکس، ئەنگلس و لینین، چەپی سەرەکی( لەندەن، ١٩٦٠ ) ل ٣٣ .

١٨- ئەم مەسەلەی هەڵوێستی مارکس و ئەنگلسە سەبارەت بە کێشەی نەتەوەیی هەندێك لە نووسەران بێناگان لێی. لەم ڕووەوەیە کە ئەفرایم نیمی، شیکردنەوەیەکی ئاڵۆزی ماتریالیستی دەخاتە ملی ئەوان، کە لەڕاستی‌یەوە دوورە. ر.ك مارکسیسم و ناسیۆنالیزم(لەندەن، ١٩٩١).

١٩- بزووتنەوەی چیکی‌یەکان زیاتر لە بزووتنەوە نەتەوەیی‌یە هاوچەرخەکانەوە نزیکتربوو تا لە بزووتنەوەکانی ڕۆژهەڵاتنیەکان و ئیسلاوی‌یەکانی باشوور. تەنانەت لە ساڵی ١٨٤٨ دا بورژوازی و وردە بورژوازی تازە پەیدابووی چیك لە هەوڵی یەکخستنی جووتیارانی بووهەیمی و موراڤیایی دا بوون لە ژێر ئاڵای بەرنامەی خۆیدا لە پێناوی گەشەپێدانی سەرمایەداری( نەتەوەیی) دا، مەسەلەیەك کە هەرگیز سەبارەت بە خەڵکی سەر زەوی‌یە بەرزەکانی ئوسکتلەندا، و برتولەکان و کارلیستەکاندا ڕاست نەبوو. ڕۆژنامەی (نوی ڕاینیشە زایتونگ)ی مارکس، هاودەردی و پشتیوانی خۆی بۆ چیکەکان نیشان دا، تا ئەرکاتەی

کـە ڕێبـەرەکانیان پشـتیوانییان لـە شـاڵاوەکانی پادشـای نەمسـا دژ بـە بزووتنەوەی دیموکراتیك، نەکرد بوو.

٢٠- نامـەی ٢ ی نۆڤەمبـەر ١٨٦٧ ، دانراوەکـانی مـارکس و ئـەنگڵس( مۆسکۆ،١٩٨٧ ) ل ٤٦٠- ل ٤٦١ .

٢١- نامەی ٣ ی نۆڤەمبەر ١٨٦٧ ، دانراوەکانی مارکس و ئەنگڵس، هەمان چاپ، بەرگی ٤٢، ل ٤٨٦-٤٨٧ .

٢٢- مـارکس بـۆ کوگلمـان، ٢٠ ی نۆڤەمبـەری ١٨٦٧ ، هـەمان سـەرچاوە، بەرگی ٤٣، ل ٣٩٠-٣٩١ .

٢٣- ر.ك ( دەربـارەی لـە نێـو چوونـی فیئۆدالـیزم و دەرکـەوتنی دەوڵەتـە نەتەوەیی‌یەکان)، کە لە کۆتـایی سـاڵی ١٨٤٨ دا نووسراوەو ئێستا لە نێو دانراوەکـانی مـارکس و ئەنگڵس دا هەیە، بەرگی ٢٦ ( مۆسـکۆ، ١٩٩٠ ) ل ٥٠٦-٥٥٦ . تەنـها دوو سـاڵ پێـش ئـەوە بـوو کـە ئـەنگڵس هێشـتا لـە( دەوڵـەتی ئاڵمـان) بەهـەمان شـێوە کـە لەچـەرخی ژولیـس سـزار دا هەیـە، ئامـاژەی پێدەکات. ر.ك دەست نووسەکەی ئەو لە بەشی( مێژووی ئەڵمانی‌یە یەکەمینەکان) لە دانراوەکاندا بەرگی ٢٦، ل ٣٠ .

٢٤- ئـا. بـاوور ( چـەمکی نەتـەوە)، لـە کێشـەی نەتـەوەیی و سۆشـیال دیموکراسی‌دا، کە وەرگێڕدراوی فەرەنسـی‌یەکەی دەگ هاوپش، ئیم لوری، وسی ویك ( ئەدیتور)، مارکسیزم و کێشەی نەتەوەیی( پاریس، ١٩٧٤ )، ل ٢٣٥ هەیە.

٢٥- ئا. باوور هەمان سەرچاوە،ل ٢٣٨.

٢٦- هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٩.

٢٧- هەمان سەرچاوە، ل ٢٤١-ل ٢٤٢ .

٢٨- هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٣ .

٢٩- هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٩ .

٣٠- هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٤ .

٣١- بەپێی بۆچوونـەکانی ئـای نیمنی، ئـەو سـەبارەت بەچـەند لایـەنێکی ڕەخنەی هەیە. مارکسیزم و ناسیۆنالیزم، هەمان سەرچاوە ل١٤٥ .

٣٢- بەرنامـە، پەسـندكراوى كۆنگـرەى حـيزبى نەمسـا لـە ١٨٨٩ دا لـە برنـۆ، ر.ك رۆزا لوكزامبـورگ، كێشـەى نەتـەوەيى( نيويـورك، ١٩٧٦) ل ١٠٤-ل ١٠٥ .

٣٣- گ. هاوپت( ماركسيزم لە هەڵوێستىدا سەبارەت بەكێشەى نەتەوەيى: مێژووى كێشەكە، ر.ك گ هاپت و هاوكارانى.

٣٤- هەمان سەرچاوە،ل ٤٩ .

٣٥- (نەتەوايـەتى و ئەنتەرناسـيۆناليزم)، نويـە زايـت، ژانويـە ١٩٠٨ ، وەرگێڕاسراوى فەرەنسى، هەمان سەرچاوە، ل ١٢٩ .

٣٦- ك. كاوتسكى( نەتـەوەى موديـرن)، نويـە زايـت ١٨٨٧ ، وەرگێڕدراوى فەرەنسى، هەمان سەرچاوە، ل ١١٩ .

٣٧- هەمان سەرچاوە، ل ١١٤-ل ١٢٧ .

٣٨- هەمان سەرچاوە، ل ١١٤.

٣٩- هەمان سەرچاوە، ل ١١٦ .

٤٠- هەمان سەرچاوە، ل ٣٥ .

٤١- هەمان سەرچاوە، ل ١٣٦ .

٤٢- ك كاوتسكى، (نەتەوايەتى و ئەنتەرناسيۆناليزم)، نويە زايت، ١٩٠٨، هەمان سەرچاوە، ل ١٣٦ .

٤٣- هەمان سەرچاوە، ل ١٣٧-ل ١٣٨ .

٤٤- بـۆ نموونـەى نـاوبراو ر.ك ئـاى نيكتى، ماركسـيزم و ناسـيۆناليزم، سەرچاوەى ناوبراو.

٤٥- ك كاوتسـكى،( نەتەوايـەتى و ئەنتەرناسـيۆناليزم)، لـە ڕۆزا لوكزامبورگـەوە وەرگـيراوە، كێشـەى نەتـەوەيى، سـەرچاوەى ناوبراو، ل ١٢٦- ل ١٢٧ .

٤٦- هەمان سەرچاوە، ل ١٢٧ .

٤٧- ر.ك ( كێشـەى نەتـەوەيى و ئۆتۆنۆمـى)، كـە لـە سـاڵەكانى ١٩٠٨-١٩٠٩دا نووسراوە، هەمان سەرچاوە، ل ١٥٩ .

کاوتسکی تا ئەو ئاستە پێشڕەوی کرد کە پێکهاتنی دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ کۆمەڵێک فاکتەر بگێڕێتەوە. یەکەمین فاکتەر پێویستی بۆرژوازی بوو بەمەبەستی دابین کردنی بازاڕێک بۆ ساغ کردنەوەی شمەکەکانی خۆی، کە نەکەوێتە نێو کەندو کۆسپەکانی دابەشبوونی قەڵەمڕەوی فیۆدالی یان دەست تێوەردانەکانی پێکهاتە کۆنەکانی دەوڵەت. فاکتەری دووەم گرنگی بەردەوام ڕوو لە زیادی بەڕێوەبردن بوو لە کۆمەڵگای مۆدێرندا، کە گرنگی‌یەکی بێ‌نموونەی بە زمان دەدا: ((بیرۆکراتیەت پێکهاتەیەکە کاریگەری بەبێ بوونی زمانێکی یەکگرتوو بە کێشە دەزانێ)) فاکتەری سێهەم ڕێگایەک بوو کە بەبێ ئەو ((بازرگانی بوونەوەی کۆمەڵگا)) زەمینە بۆ یەکێتی زمانی بە زیاتر بوونی تێکەڵاوی و پەیوەندی نێوان خەڵک لە ناوچە جیاوازەکاندا، پێک دەهێنێ، و ئەم زمانە یەکگرتووەش شێوازێکی‌تر دێنێتە ئاراوە: ((هەمەگونی بە دەگمەن لە ڕووی پەروەردەکردنەوە بەدەست دێت، بەڵکو زیاتر بەرهەمی فراوان بوونی پەیوەندی بازرگانی‌یە لە ناوخۆی دەوڵەتدا)).

* * *

بەشی زۆری ئاسیا... یان کۆلۆنی (ژێردەستە) زلهێزەکانە یان لە دەوڵەتانێک کە تا دوائەندازە ژێردەستە بوون و نەتەوە ژێردەستەکانن، پێکهاتووە. بەڵام ئایا ئەم پرسە، ڕاستی‌یەکی گومان هەڵنەگر کە هەر لە خودی ئاسیادا هەل و مەرج بۆ باشترین تەکامولی بەرهەم هێنانی کاڵایی و خێراترین گەشەی سەرمایەداری لە ژاپۆن - تاکە دەوڵەتێک کە لەسەر بنچینەی نەتەوەیی پێکهاتووە- ڕەخساوە، لەق دەکات!... ڕاستی تکۆڵی لێنەکداو ئەوەیە کە سەرمایەداری بەدواخستنی ئاسیا، بزووتنەوە نەتەوەیی‌یەکانی لەم کێشوەرەدا جڵەو کردووە؛ ئەم بزوتنەوانە، مەیلی پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەییان هەیە؛ (ئەمەش بۆ خۆی ڕاستی‌یەکە) ئەم دەوڵەتانە باشترین هەل و مەرج لەپێناوی تەکامولی سەرمایەداری‌دا دەڕەخسێنن...

دەوڵەتی نەتەوەیی بنچینەو قانوونی سەرمایەداری‌یە... لە ڕوانگەی پەیوەندی‌یە نەتەوەیی‌یەکانەوە، باشترین هەل و مەرج لەپێناوی تەکامولی سەرمایەداری‌دا دەوڵەتی نەتەوەیی دروستی دەکات. هەڵبەتە ئەمە ئەو مانایە نابەخشێ کە دەوڵەتی لەو چەشنە، کە بەپەیوەندی‌یە برۆوازی‌یەکان پشت ئەستوورە، دەتوانێ چەوسانەوەو ستەمی نەتەوەیی لەنێوببات. ئەم پرسە تەنها بەو مانایەیە کە مارکسستەکان ناتوانن ئەو فاکتەرە ئابووری‌یە بەهێزانەی کە مەیل و ئارەزووی دروست کردنی دەوڵەتی نەتەوەییان بەرهەم هێناوە، لەبەرچاو نەگرن.

لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی شۆڕشگێرانی کۆمۆنیست

نرخی ٧ دینارە